## دەربارەی بابەتەکان و بنەمای دیالکتیکی رۆشنگەری

کتێبی دیالکتیکی رۆشنگەری، بەژێر ناوی پارچە فەلسەفەییەکان-ەوە، بۆ یەکەم جار لەساڵی ١٩٤٧داو لەشاری ئەمستەردام بڵاوکرایەوە. ئەم کتێبە پاش کۆتایی‌هاتنی شەڕی دووەمی جیهانی نووسرا، واتە ئەو کاتەی کە جیهانی شارستانی و ئازاد بەیارمەتی ستالین و بۆمبای ئەتۆم لەئاکامدا هەرەسی بەسەر نازیزمی هیتلەری‌دا هێنا. شەڕ لەسەر بڕیاری رامیارگەلێکی تێگەیشتوو پێگەیشتوو بەکۆتایی‌هات کەپێیان وابوو بەکۆمەڵ کوشتنی چەند سەد هەزار کەسی مەدەنی بەمەبەستی بەرگری‌کردن لەدرێژەپێدانی شەڕو کوشتنی چەند میلیۆن کەسی دیکە بڕیارێکی ئەقلانییە.[1] بناخەی ئەقلانیی شاراوە لەئاوا بڕیارێکدا لەسەر رێسایەکی ساکاری ماتماتیکی دامەزرابوو، چونکی کێ ئەتوانێ نکووڵی لەو راستییە دیارە بکات کە سێ میلیۆن زۆرتر لەسێ هەزارە.

بەڵام، لەڕوانگەی نووسەرانی دیالکتیکی رۆشنگەری-یەوە، واتە هۆرکهایمرو ئادۆرنۆ، ئەم بڕیارە نەك هەر بەڕووداوێکی پڕ کارەسات بەڵکو بەوەدیارکەوتنی ئاشکرای دژایەتییەکانی ئاوەزئامرازیی و دەرئەنجامی لۆژیکی بیست و پێنج سەدە پێشکەوتن لەپێناو شارستانێتی و تەکنۆلۆژیا

دادەنرا. ئەو راستییە میژووییەی کە سەرکەوتن بەسەر وەحشیگەریی هیتلەریدا هەر لەریگەی بەکارهینانی میتۆدو ئامرازگەلی هەمان وەحشیگەرییەوە سەرئەگریٚ خۆی لەخۆیدا بیروبۆچوونیکی والتر بینیامین دووپات دەکاتەوە کە بۆخۆی یەکێ لەقوربانیانی نازیزم بوو و، سەبارەت بەم بابەتە دەلیٚ: "سەرلەبەری نیشانەو بەلگەکانی شارستانیتی بەراستی هەموویان نیشانەو بەلگەگەلیوەحشیگەرین". ئەگەر بیر لەوەش بکەینەوە کە پیچەوانەی ئەم گوزارەیە لەباری میژووییەوە دیسانەوە هەر راستە-یان، بەواتایەکیتر، وەحشیگەریی هیتلەریش لەریگەی بەکارهینانی ئامرازو میتۆدە ئەقلانییەکانەوە هیزی ئابووریی، کۆمەلایەتیو کولتووریو سوپایی خۆی پتەوتر دەکردەوە-ئینجا مانای راستەقینەی زاراوەی (دیالکتیکی رۆشنگەری)مان بۆ روون دەبیتەوە. واتە، لەبەستینی ئەم دیالکتیکە میژووییەدایە کە رابردوو و ئیستا، ئوستوورەو رۆشنگەری، هیزو زانیاریو شارستانیتیو وەحشیگەری تیکەلی یەکدی دەبنو دژایەتیو دژوارییەکانی ناو ئەقلی خاوین وەدی دیٚ کە هۆرکهایمر ناوی ناوە (شەری ئەقڵ لەگەڵ ئەقلدا).

نووسەرانی دیالکتیکی رۆشنگەری ئەم دیالکتیکەیان لەروانگەگەلی جیاوازەوە خستۆتە بەر تیشکی هەلسەنگاندنو نرخاندنو، بەمەبەستی دەربرینو دەستنیشانکردنی سروشتو چیەتییە میژووییەکەی چەندین پۆلینبەندیی

جۆراوجۆریـان بـەکارهێناوە: پـەیوەندیی نـاوەکیی نێـوان هـەوڵی مـرۆڤ بـۆ پاراسـتنی خـود لەبەرامبـەر هەڕەشـەی سروشـتو تـرس لەمـەرگ لەلایەکـەوەو لـەناوبردنی خـود لەلایـەکی ترەوە؛ گواسـتنەوەی بنەواشـەی دەسـەڵات بەسـەر سروشـتدا بـۆ بەسـتێنی ژیـانی کۆمەڵایـەتی، کـە دەسـەڵاتی مـرۆڤ بەسـەر مـرۆڤو گۆڕانـی کۆمـەڵگا بـۆ (سروشـتی دووەم)ی بەدواوەیە؛ وەدیارخسـتنی سروشـتی ئوسـتوورەیی ئەقڵی مودێرنو سروشـتی ئەقلانیی ئوسـتوورە وەکو یەکـەم هـەنگاوی ئـەقلانی بـۆ وەچنـگ خسـتنی دەسـەڵات بەسـەر جیهانی ناوەوەو دەرەوەدا؛ پێوەندیی بنـەڕەتیی نێوان هـەوڵ بۆ سەرکوتکردنو هێنانە ژێر رکێفی هێزو وزە سروشتییەکان (بەیارمـەتیی هـزری تیۆریـکو زانسـتە سروشـتییەکانو تـەکنۆلۆژیا) لەلایەکەوەو رەوتی بیچمگیریی بنیاتنانی خـود لەلایـەکی دیکـەوە، کـە لەڕێگـەی سـەرکوتکردنی سروشـتی نـاوەکیو زاڵبوونـی ئـەقڵ بەسـەر غـەریزەدا سـەرئەگرێ (بەیارمـەتیی ئـەقڵی کردەیـیو ئاکـار)؛ دەستنیشـانکردنی دەسـەڵات وەکـو پرەنسـیپی سـەرەکیو زاڵ لـەبوارە جۆراوجۆرەکـاندا وەك ئـابووری، کۆمـەڵ، رامیـاریو بیریـاری (فەلسـەفەو لۆژیـك)و ئامـادەبوونی میکـانیزمی دەرهەسـتی گۆڕینـەوەی نابەرابـەر لەهـەموو بوارەکـاندا-کـە رێورەسمـی قوربـانیکردن یەکەم نموونەیـەتی- لەگۆڕینـەوەی نابەرابـەری کەلوپەلـەوە (کـە بۆخـۆی بناخـەی سـەرهەڵدانی پـارەو دەرهەستکردنەوەی پێوەندییە ئابوورییەکانە) تا گۆڕینـەوەی

نابەرابەری بابەتەکان (کە ئەمەش بناخەی بیچم گیریی (چەمکەکان)و (بیرکردنەوەی دەرهەستانە) پێکدێنێ) تا دەگاتە گۆڕینەوەی هێزو توندوتیژی.

هەڵبەت ئەو خاڵانەی سەرەوە تەنیا بەشێکی بچووك لەپۆلێنبەندییە ڕەخنەگرانەو ئاڵۆزەکانی دیالکتیکی ڕۆشنگەری پێکدێنن. کۆکردنەوەی هەموو ڕەهەندە ڕەخنەگرانەکانی ئەم دیالکتیکە سەرومڕ پێکەوە لەڕواڵەتی پۆلێنبەندییەکدا کارێکی زۆر ئەستەمو سەخڵەتەو تاڕادەیەکیش ئەکرێ بوترێ هەر سەرناگرێ، بەڵام، هەروەك یورگن هابرماس وتوویەتی، لەدواکتێبی فەلسەفیی تیئۆدۆر ئادۆرنۆدا، واتە دیالکتیکی نەگەتیڤ، دەستەواژەیەکی ئاڵۆزو دژوار هەیە کە بەم شێوەیە ئیدەی سەرەکیی (دیالکتیکی ڕۆشنگەری) دەردەبڕێ:

ئەمەکە ئەقڵ جیاواز لەسروشتو سەرەڕای ئەوەش ڕەهەندێکی ناوەکییەتی-ئەم خاڵە دەربڕی پێش مێژووی ئەقڵە، کە بۆ بەشێك لەجەبرە ناوەکییەکەی (immanent determination) گۆڕدراوە. ئەقڵ وەکو ئەو هێزە دەروونییەی کە بۆ وەدیهاتنی مەبەستەکانی پاراستنی خود (لەهێزە دەروونییەکانیتر) دەستنیشانو جیاکراوەتەوە دیاردەیەکی سروشتییە؛ وێڕای ئەمەش، ئەوکاتەی کە جیاکراوەتەوەو لەبەرامبەر سروشت دانراوە، لەهەمان کاتدا، بۆ هەر شتێکی دیکە جگە لەسروشت (The Other of nature) ئەگۆڕدرێ. ئەقڵ، کەخێرا ئاستی سروشت بۆ باڵاو ئەندازەی خۆی دادەبەزێنێ،

لەگەڵ سروشتدا (ئەمئەو)و (نائەمئەو)ەو، لەبەراورد لەگەڵ چەمك و ماناکەی خۆیدا سروشتێکی دیالکتیکی هەیە، بەڵام ئەقڵ تا زۆرتر لەناخی ئەم دیالکتیکەدا بەشێوەیەکی هەوسار پچڕاوەتر بۆ شتێکی رەهای زاڵ بەسەر سروشتدا بگۆڕدرێ و، لەرەوتی ئەم لەناوچوونەیەشدا (سروشتی بنەرەتی)ی لەبیربچێتەوە، زۆرتر لەجاران، وەکو شکڵێکی هەوسارپچڕاوەتر لەخۆباوەڕی و راست دانانی خود (ی مرۆیی)، بەرەو ناوەوەی سروشت پاشەکشێ (regression) دەکات؛ ئەقڵ هەر تەنیا ئەو کاتەی کە لەپێگەی رەنگدانەوەی سروشتدایە ئەتوانێ پەرسروشت (supernature)بێ.(٢)

ئادۆرنۆ لەبەرهەمە پێشووەکانیدا هەوڵی دابوو بەیارمەتیی چەمکی بینیامینیی (مەنزوومە)و (وێنەگەلی دیالکتیکی) رەهەندە ئوستوورەییەکان یان (وێنەگەلی ئوستوورەیی شاراوە لەناخی مودێرنیتەدا) (The archaic images of Modernity) دەستنیشان بکات، بەڵام لەدیالکتیکی رۆشنگەری دا، هاوڕی لەگەڵ هۆرکهایمر، رێگەی پێچەوانەی ئەم رەوتەیان پێوا؛ بەواتایەکیتر، ئادۆرنۆ لەم قۆناغەدا وردەکاری و تایبەتمەندییە بنچینەییەکانی ئەقڵانییەتی مودێرن لەئوستوورە کۆنەکانداو بەتایبەت لەئودیسەی هۆمێردا ئەپشکنێ. بەوتەی خودی ئادۆرنۆ، بابەتی سەرەکیی دیالکتیکی رۆشنگەری شتێ نییە جگە لەمێژووی سەرەتایی سووژە یان زەینی ئەقڵانی، کە بەراستی هەمان مێژووی دەسەڵاتە؛ چونکە سووژە یان رەسەنایەتیی سووژە

(واتە، سووژەیی خوازی) (Subjectivism)بناخەی ئوستوورە، میتافیزك، زانستو تەكنۆلۆژیا پێك دینێ. هەر بەهۆی وەها بۆچوونیكەوەیە كە لەدرێژایی مێژوودا زۆرێك لەبیرمەندان، ئوستوورەو میتافیزكو، لەسەردەمی نویشدا زانستو تەكنۆلۆژیا یان، وەكو شیوەگەلی جۆراوجۆری لەخۆ نامۆیی مرۆڤ پیشان داوە؛ واتە، شیوەگەلیك كە بەرجەستەبوونی هیزو توانستە ناوەكییەكانی مرۆڤو كۆمەلگەی مرۆیی كە ئەبوایە وەكو ئامرازگەلی دەسەلات بەسەر جیهاندا مانەوەی مرۆڤیان لەئەستۆ بگرتبایە، بەلام لەئاكامدا لەمرۆڤ جیاو نامۆ بوونەتەوەو لەرواڵەتی هەندێ ئامرازو خزمەتكاری سەركەشدا خۆیان بەسەر مرۆڤدا زاڵ كردووە. لەخۆنامۆیی ناویكی دیكەی ئەم رەوتە میژووییەیە كە لەدرێژایی وەها پرۆسەیەكدا پاراستنی خود ئەگۆردرێو ئەبێ بەلەناوچوونی خود.

دیالكتیكی رۆشنگەری ئەم رەوتە وەكو پرۆسەی پەرەسەندنی هەمەلایەنەی دەسەلات بەسەر سروشتدا (سروشتی ناوەكیو دەرەكی)و دەرهەستنەبوونی ئەزموونو بیركردنەوەی مرۆیی لەقەلەم دەداو، بەمەبەستی دەستنیشانكردنی پەنجە دەخاتە سەر چەند قۆناغیك بیگومان تویكاریی ئەم (قۆناخانە) لەباشتر تیگەیشتنی بابەتە ئالۆزو دژوارەكانی ئەم كتیبەدا دەوریكی سەرەكی دەگیرێ- سەرەرای ئەمەش، وەسفو یاخود كورتكردنەوەی بابەتەكانی ئەم كتیبە لەرواڵەتی فۆرمیكی جیا لەوەی بەرهەمەكەو،

هەروەها لە((قۆناخەکانی پەرەسەندنی دەسەڵات)) بێگومان ڕێگە بۆ چەوت تێگەیشتن و ڕاڤەی پڕهەڵە دەکاتەوە؛ لەم گێڕانەوە تایبەتەی مێژووی سوورژەدا شێوە و ناوەرۆك بەڕاستی لێك جیاناکرێتەوە و هەردووکیان بەیەك ئەندازە گرنگ و سەرنج ڕاکێشن. بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هەندێ ڕاڤەی ناڕاست و پڕ لەهەڵەی لەم چەشنە، لەبەشی دووەمی ئەم نووسینەدا چەند خاڵێك لەمەڕ بنەماو فۆڕمی دیالکتیکی ڕۆشنگەری دەخەینە بەرباس و لێکۆڵینەوە.

مێژووی سوورژە و قۆناغەکانی لەڕاستیدا هەمان مێژووی بەرهەمهێنان و بەرهەمهێنانەوەی دەسەڵاتە. میکانیزمی ئەم بەرهەمهێنانەوەیەش لەسەر دوو کۆڵەکەو بنەواشەی (گۆڕینەوە) و (دەرهەستکاری) دامەزراوەکەبەڕاستی دوو ناوی جیاوازی یەك واقیعن و، هەرکاتێ لەبەر ڕۆشنایی (دوانەی سوورژە و ئوبژە)وە سەیربکرێن، بۆ سەر دوو ڕەهەندی عەینی و زەینی (واتە، بابەتیانە و ناسکارانە)دا بەشدەکرێن و وێدەچێ مرۆڤ یەکەم جار لەڕێگەی گۆڕینەوەی کەلوپەلەوە لەگەڵ شتێك بەناوی (دەرهەستکاری)دا ئاشنابووبێت. گۆڕینەوەی دوو چشتی جیاواز، بتەوێ و نەتەوێ، مرۆڤ دەخاتەوە بیر لێکچوون و هاوسانی و، لەئاکامیشدا بەرابەریی ئەو دوو چشتە. لەبەرئەوەی کە جیاوازیی نێوان دوو چشتەکە لەبری یەك ئەگۆڕدرێنەوە دیارە بۆ واقیع و تایبەتمەندییە بەرهەستەکانی ئەو دوو چشتە ئەگەڕێتەوە، کەواتە بەمەبەستی دۆزینەوەی بەرابەری و یەکسانیی نێوان

ئەو دوو چشتە پێویستە لەئاقارێکدا بەدوایدا بگەڕێین کە ئەکەوێتە ئەوپەڕی ئەزموونی بەرهەستی مرۆڤەوە. ئەمەش یەکەم هەنگاو بوو لەپێناو بەرهەمهێنانی چەمکگەلێك وەك (ئەمئەوەکی)، (زات)و (جەوهەر).

گۆڕینەوەی دوو چشتی جیاواز بەلاّم هاوسان بەمانی گۆڕینەوەی دووشتی نابەرابەرە کە دەلّێی پێکەوە بەرابەرن، بەلاّم، نیچە وتەنی، (چەمکەکان بەهۆی هاوساندنانی شتە ناهاوسانەکانەوە سەریانهەلّداوە)[٣]. زات یان جەوهەر، کە ئەرکی یەکسانیی چشتی لەگەلّ خۆیو ئەویدی لەئەستۆ بوو، لەسەرەتادا شتێ نەبوو جگە لە(چەمك). وێڕای ئەمەش، لەبواری بیریارییو فەلسەفەدا دوو هەزار سالّی خایاند تاکو یەکێتی زاتگەرێتیو رەسەنایەتیی سووژە (Subjectivism)، واتە یەکێتی زاتو چەمكو لەئاکامیشدا یەکێتی زاتو سووژە روون بێتەوە.

دیاریکردنی ئامادەبوونی هەرە کاریگەری دیالکتیکی (گۆڕینەوە)و (دەرهەستکاری) لەسەرجەم بوارەکانی ئەزموونو ژیانی تاكو کۆداو تیشك خستنە سەر دەوری هەرە سەرەکیی ئەم دیالکتیکە لەپێش مێژووی ئەم بوارانەدا کارێکی زۆر ئەستەمو دژوار نییە لەبواری ئابووریدا، بەردەوامیی (گۆڕینەوە)و (دەرهەستکاری) لەئەنجامدا بووە هۆی بەدیهاتنو سەرهەلّدانی (پارە) کە بەڕاستی ئەبێ وەکو بەهێزترینو سیحراویترین (دەرکەوتە)ی گۆڕینەوەو دەرهەستکاریو پێوەندی نێوانیان دابنرێ پارە

دەرهەستترینو گشتیترین کەلوپەلەو بەهۆی نەبوونی هەر چەشنە جەبرێکی زاتییەوە ئەتوانرێ لەگەڵ (بوونی رەها) لەلۆژیکی هێگێلیدا بەراوردبکرێ. پارە، بەڵام، بەوێنەی کەلوپەلێکە هەموو تایبەتمەندییەکانی لەچەندایەتیو ژمارەدا بەرجەستەو کۆکراوەتەوە، بەر لەهەرشتێکی دیکە خۆی لەخۆیدا ئامرازی گۆڕینەوەیە. (گۆڕینەوە) گرنگترین کاربردی ئەم کەلوپەلە سیحراوییەیە کە ئەتوانێ هەموو شتێ بۆ خۆیو خۆیشی بۆ هەموو شتێ بگۆڕێتەوە. کەواتە بەم شێوەیە ئەو شتەی بەرهەمو ئاکامو وەکو دەرکەوتەی دەرهەستی گۆڕینەوە بوو، واتە پارە، پەرەسەندنو گەشەکردنی گۆڕینەوەی هێنایەدیو، لەم سۆنگەیەوە دیالکتیکی (گۆڕینەوە)و (دەرهەستکاری) وەکو یاساو رێسای هەتا هەتایی بواری ئابووری خۆی مسۆگەر کرد.

ئەگەرچی ئامادەبوونی ئەم دیالکتیکەو ئاکامەکانی لەبواری ئابووریدا روونو ئاشکرایە، بەڵام وادیارە کەباسکردن لەنموونەیەکی دیکە- کە رەنگە لەباری مێژووییەوە لەدواترەوە بێو وەکو (نموونەی یەکەم) دابنرێ تیگەیشتن لەگشتیتیی بابەتەکە ساکارتر دەکاتەوە؛ ئەمەش لەبەر ئەو هۆیەیە کە ئەم نموونەیە، واتە ریورەسمی قوربانیکردن، تارادەیەك هەموو رەهەندەکانی ئەو دیالکتیکەی سەرەوە لەخۆدەگرێ.

لەکۆمەلگا بەرایيو سەرەتاییەکاندا ریورەسمی قوربانیکردن لەبنەرەتدا جۆرێ لەگۆڕینەوەو، یان بەواتایەکی

وردتـر، جـۆرێ لـەکرینو فرۆشـتن بـوو (چونکـە لیرەشـدا دیسـانەوە توخمـە ناهاوسـانو نابەرابـەرەکان بەوینـەی هاوسـانو بەرابـەر لـەبری یـەك ئەگۆردرینـەوە). لـەم ریورەسمـەدا، مرۆڤـی بـەرایی هـەوڵ ئـەدا بوونـەوەری قوربـانیکراو لـەجیاتی بـاران یـان بەرهـەمی باشـی هیزگـەلی نەناسراوو زاڵ بەسەر سروشتدا بگۆریتـەوە. ئـەم ریورەسمـە بەئاشکرایی دەربری هەولیکی تەواوە بۆ مانـەوەی کۆمـەلگاو پاراسـتنی خـود. هەلبـەت دوا مەبەسـتی وەهـا هـەوڵو تەقەلایەکیش وەچنگ خستنی دەسەلات بەسەر سروشتدایە. ریورەسمی قوربانیکردن لەکۆمەلگا سـەرەتاییەکاندا بـەهۆی بنەمای ئەقلانیو مەبەستداری خۆیەوە، کە لـەرووی ئالۆزیی بنـەماییو لۆژیکـی ئامرازییـەوە چیـدی لەنموونـە تەکنۆلۆژیکەکانی رۆژگاری ئیمەی کەمتر نییە، نموونەی هەرە بەرچاوی کردەیـەکی مەبەستدارو ئەقلانییە. ئـەم ریورەسمـە خۆی لەخۆیدا بەراستی ئامرازیکە بۆ جێبەنجەدانان لەسەر ژینگـەی سروشتیو هینانە ژیر رکیفیئەو ژینگەیە؛ لـەویوە کـەژیانو تەندروسـتیی سـەرجەم ئـەندامانی عەشـیرەتیك پیوەندیـی راسـتەوخۆی بەهەلسـوکەوتی راسـتەقینەی ئـەو عەشـیرەتەوە هەیـە، پەرەسـەندنی گرنگایەتیوگەشـەکردنی هـیزی کۆمەلایـەتی بەریوەبەرانو ئـەندازیارانی ئـەم ئـامرازە، واتـە سـەرۆك عەشـیرەو سـیحرکارو غـەیببیژانی عەشـیرە، شـتیکی زۆر ئاسـاییو سروشـتییە. گۆرانکـاریی میژوویـی ریورەسمی قوربانیکردن بەباشی ئەو راستییەمان پیشان دەدا

که بەچ شیوەیەك هەولدان بۆ پاراستنی خودو دەسەڵاتداریتی بەسەر سروشتدا، هاوکات لەتەك پەرەسەندنی دابەشکاریی پیشەکانو دەرهەستنەبوونی پیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، بۆتە هۆی بیچم گیریی هەندێ پیوەندی لەسەر بناخەی دەسەڵاتداریتی لەخودی کۆمەلگادا. نموونەی هەرە ئاشکرای ئاوا گۆرانکارییەك لەمیژووی ئایینەکانی هیندی کۆندا بەسانایی وەبەرچاو دەکەوێ. لەسەرەتای نیشتەجیبوونی عەشیرە ئارياييەكان لەولاتی هیندداا رەوشتی ئەوان ((بۆ سەرنج راكیشیی ئەم خوا (ئاسمانی) گەلە زۆر ساكاربوو؛ لەهەر بنەمالەیەكدا باوكو دایكەكە دەوری زانا ئاینییەكانیان دەگیرا. سەرەتا شوینیکی پیرۆزو تایبەت بەپەرستشتکردن لەئارادا نەبوو. مەبەستی ئارياييەکان هەر تەنیا وەدەست هینانی لایەنگریی خواكان بوو، ئەویش لەریگەی جیبەجیکردنی ریورەسمی قوربانیکردنەوە. هاوکات لەگەڵ پیشڤەچوونی ئەم ریورەسمانەدا کۆمەلی غەیببیژو فالگریش وەدیهاتن کە زنجیرەیەکی بەربلاوو دوورودریژی دوعاو نزاو تەلیسمە سیحراوییەكانیان داهینا. ئەم نەریتە سەرزارەكییە کە مافی ئاشنايەتی لەگەلیدا هەر تەنیا تایبەت بەفالگرو غەیببیژان بوو، وە دووی هەمان مەبەستی پراکتیکیی وەچنگ خستنی لایەنگریی خواكان کەوتبوو.))[٤] هەلبەت دوائاکامی ئەم گۆرانکارییەش سەرهەلدانی سیستەمی کاسیتی بوو کە لەسەرروویەوە (کاهین)و (برەهمەن)ەكان ئامادەبوون، چونکی هەر ئەوان توانای ئەهوەن کردنەوەی

خواکانیان هەیەو هەر ئەوان ئەتوانن لەگەڵ خواکان بپەیڤن.. بەتیپەربوونی کات، برەهمەنەکان لەو باوەرەی کە خۆیان لەخەلکی ئاسایی بەباشتر دەزانی دەربازبوونو ئیدعای ئەوەیان دەکرد کە تەنانەت لەخواکانیش باشترن. ئەوان بەردەوام گرنگایەتیی ریورەسمەکانیان دووپات دەکردەوەو ئەیانوت کە هەموو جیهان لەریگەی ریورەسمی قوربانیکردنەوە ئافرینراوە: (لەناخی ریورەسمی قوربانیکردنەوە بوو کە خواکان سەریان دەرهینا. بیگومان ئەگەر کاهین قوربانیی نەدەکرد، خۆرەتاویش هەلنەدەهات.))[٥].

ئەو نموونە زەقەی سەرەوە، بەتایبەت بەهۆی دەست نیشانکردنی دینامیزی دونیایی ریورەسمی قوربانیکردنو ماناو واتا بوونناسانەوەو کیانناسانەکەیەوە، بابەتیکی زۆر سەرنج راکیشو گرنگ دیتە بەرچاو؛ بەلام خالی سەرەکی لیرەدا دەربری ئەو راستییە میژووییەیە کە، هاوکات لەگەڵ پیشکەوتنی ژیارو شارستانیتیو ئالۆزیی کولتوورو، ریورەسمی قوربانیکردن چیدی نەك هەر زەمینەیەك بۆ هاوکاریی ئازادانەی سەرجەم ئەندامانی کۆمەلگا دەهاتە ژمار، بەلکو تەنانەت وەکو کۆمەلە کردەو دامەزراوەیەکی زۆر تایبەتو ئەقلانیش دادەنرا.

تا ئەو شوینەی پیوەندیی بەبابەتی ئەمئوەکیی خود، بیچم گیریی شوناسی تاکی، ئەندامیتی تاك لەکۆدا، ناوەکیکردنەوەی دەسەلاتو دەسەلاتداریتیو بابەتەکانی

تری (دەروونناسیی کۆمەڵایەتی)یەوە هەبێ، هەر تەنیا ئاماژەکردن بۆ زۆریک لەتیۆرە جۆراجۆرەکان سەبارەت بەمانای تۆتەم، قوربانیکردنو خواردنی تۆتەم خۆی لەخۆیدا بەئەندازەی پیویست روونو ئاشکرایە، هەرچەندە ئەبێ ئەمئەوەکیو یەکیتی نیوان خودە تاکییەکانو یاخود عەشیرەکە لەگەڵ تۆتەمداو، لەکۆتاییشدا پیوەندیی ریورەسمی نیچیرو قوربانیکردنی تۆتەم بەئایینی کۆکردنەوەو پەسندبوون بۆ ناوەوەی کۆ رەچاو بکرێو گرنگایەتیی بدریتێ. لیرەدا ئەوەی مابیتەوەو، یان باشتر بلیین، گرنگترین شت دەستنیشانکردنو خستنەرووی پیوەندیی ریورەسمی قوربانیکردن بەبابەتی (دەرهەستکاری)یەوەیە، چونکە پیوەندیی ئەم ریورەسمە بەپاراستنی خودو دەسەڵاتو گۆرینەوەوە تا ئەو جیگەیەی توانرا لەووتانەی سەرەوەدا ئاشکرا کرایەوە. دەرهەستکاری لەبنەرەتدا جەوهەری کۆمەڵایەتیی ریورەسمی قوربانیکردن لەکۆمەلگا سەرەتاییەکاندایە. تیپەرین لەقوربانیکردنی مرۆڤ بۆ قوربانیکردنی هەر بوونەوەریکی دیکە لەبنەرەتدا بەمانای دەربازبوون لەشتە تایبەتیو تاکییەکانە بۆ شتە گشتیو چەشنییەکان، لەبەرئەوەی کە بوونەوەری قوربانیکراو هەر تەنیا نموونەیەك لەرەگەزو چەشنەکەی خۆیەتیو ئیدی لەخۆگری هەر جۆرە تایبەتمەندیو چۆنایەتییەکی زاتی نییە. ئەم بوونەوەرە ئاکامو بەرهەمی دەرهەستکارییەو بۆ خۆشی شتیکی دەرهەستە. لیرەشدا، تەنیا مۆرکو پیوانەی هەلسەنگاندن بریتییە لەچەندایەتیو ژمارە، کە هەمان

ژمـــارەی قوربانییەکانـــە. لـــەپاڵ ئەمەشـــدا، ریورەسمـــی قوربـانیکردن لەکۆمـەلگا سـەرەتاییەکاندا لەهـەموو کـاتیکدا ئاویتـەی دەرهەسـتکاری بـووە. ئـەم ریورەسمـە پیشـاندەری جـۆریٚ لەگۆرینـەوە (یـان باشـتر بلیـین جـۆریٚ لـەکرین و فرۆشتن)ی دوو شتی نابەرابەرە: گیـانی مـرۆڤ یـان گیـانی بوونـەوەریکی تر لەهەمبەر ژیان و تەندروستیی کۆمـەلگا یـان عەشـیرەتیك. دیـارە کـە لـەم کریـن و فرۆشتنەشـدا هـەموو قازانجـــەکان بـــۆ مرۆڤـــی بـــەرایی تـــەرخانکراوە؛ ئـــەویش جیبەجیکردنی ئەم گۆرینەوە پر لەسوودە بەنیشانەو هیمای بـیرتیژی و زیرەیکیـی خـۆی لەقەلـەم دەدا کـە توانیویـــەتی بەنرخیکی کەمەوە خۆی بەسەر هیزە زلەکانی سروشتدا زاڵ بکات. خۆ بەزلزانی و فەخری کاهین و برەهمەنە هیندییەکان، کـە نزیکایەتییـەکی سـەیری لەتـەك خـۆ بـەزلزانی و فـەخری مرۆڤـی مۆدیرنـدا هەیـە، ئاکـام و دەرئـەنجامی هـەر هـەمان بۆچوونـــە، پالـــەوانی ئودیســـەی هۆمـــیریش، وەك هـــەر بورژوایەکی سەرکەوتووی دیکە، بەپشت بەستن بـەتیرتیژی و زیرەکـی و لەریگـەی قوربـانیکردنی هـاوریٚ و خزمـەتکارو داراییـەوە، سـەرەرای هـەوڵ و پیلانـی تـاقمیك لـەخواکان، لەئاکامدا زیندووو تەندروست بۆ مالەکەی خۆی ئەگەریتەوە تاکو، دوای بەکۆمەڵ کوشتنی سەرجەم رەقیب و نەیارەکانی، سەریری پاشایەتی و خیزانەکەی لەئامیز بگریتەوە. بیرتیژی و ژیریی ئەقلانیی پالەوانی ئوستوورە، کە لەکۆتاییدا لەریگەی قوربـانیکردنی هەموانـەوە سـەرئەکەویٚ، خـالی بەرامبـەری پالـەوانی تراژیدییە، کـە خۆبـە قوربـانیکردن و دۆران و گیـان

بەختکردن بەشیوەیەکی هۆشیارانەو بەئاگادارییەوە پەسند دەکات-بەڵام، تەنانەت بەم وەسفەشەوە، هەردووکیان هەمویان لەژێر سیبەری لۆژیکی قوربانیدان.[٦]

بەم شیوەیە دەبینین کە ریورەسمیقوربانیکردن لەکۆمەڵگاسەرەتاییەکاندا بەراستی (نموونەی یەکەم)ی دیالکتیکی گۆڕینەوەو دەرهەستکاریو دەستپیکی بیچم گیریی سووژەو دامەزراندنی دەسەڵاتە. بەوتەی یەکێك لەراڤەکارانی بیروراگەلی ئادۆرنۆ، پیوەندیی ریورەسمی قوربانیکردنو دەسەڵات پیکەوە بابەتو واتای سەرەکیی دیالکتیکی رۆشنگەری پیکدینێ: (هەولدان بۆ وەدەستهینانی (توانای) کۆنترۆل، بەردەوام شیوەی ریورەسمی قوربانیکردنی هەبووە، نەك لەبەرئەوەی کە بەریوەبەرایەتیو بەریوەبردنی (چوارچیوەی) دەسەڵاتەکە خراپ بووە، بەلکو بەو بۆنەیەوە کە ریورەسمی قوربانیکردن لەبنەرەتدا هەمان واقیعی دیالکتیکی دەسەڵاتە.. دەسەڵات بەردەوام پیویستی بەقوربانیکردن هەیە: کیانو بوونی خود قەرزانباری قوربانیکردنی ئیستا لەبەردەم داهاتوودایە؛ دەرهەستکاری، ئەم شیوە کردەیەی (modus operand) کۆنترۆلی زانستی، شتێ نییە جگە لەقوربانیکردنی شتە تایبەتییەکان لەبەردەم گشتییەکاندا.)[٧] هەلبەت دەکارین قوربانیکردنی غەریزە لەبەردەم ئەقلدا، تاك لەبەردەم کۆو سروشت لەبەردەم تەکنۆلۆژیادا بخەینە سەر ئەم پیرستە کورتە.

دیالکتیکی رۆشنگەری لەبنەرەتداو بەراستی گیرانەوەیەکە لە میژوو و (پیش میژوو)ی دەسەڵاتی سووژە

(واتــه، مــرۆڤ) بەســەر ئوبــژەدا (واتــە، سروشــت). ئــەم گیرانەوەیــە لــەزۆر رووەوە لــەو گیرانەوەیــە ئــەچێ کــە ڤیکــۆ لەزانســـتی نـــوێدا ئاراســـتەی دەکـــا،[8] هەلبـــەت بـــەم جیاوازییەوە کە لەدیالکتیکی رۆشنگەریدا هیچ ناوونیشانیك لەبابەتی ئوستوورەناسانەو زۆر نەرمرۆیانەی ئەلقە ئەلقەبوون (یـان دەورەیـی بوون)ی میـژوو وەبـەرچاو ناکـەوێ. (هەلبـەت خـودی ڤیکـۆش میـژووی وەحیـانی یـان میـژووی نەتـەوەی هەلبژاردە بەگشتی لەم یاساو، یاخود، قەدەرە ئوستوورەییە جیادەکاتـــەوە.) گیرانەوەکـــەی ئـــادۆرنۆو هۆرکـــهایمر بەشیوەیەکی ناراستەوخۆ چوار قۆناخ دەگریتـەوە. هەلبـەت ئـــەوان هیـــچ کـــات بەراشـــکاوی لەمـــەر (قۆناخەیـــەك لەدوای‌یەکـەکان)ی میـژوو بـاس ناکـەن و بـەگویرەی جۆریـك (یاسای گشتیی تەجریدی) لیکدی جیایان ناکەنەوە. لیرەدا، مەبەســـت هـــەمان رەوتـــی میژوویـــی و هەســـتپیکراوی ئـەقلانیتربوونی زانسـتی مرۆییـە کـە بـەردەوام گشـتیترو دەرهەسـتتر بۆتـەوە، نـەك دۆزینـەوەی (یاسـاگەلی زانسـتی و بابەتیانە)ی میژوو. هیچ پیوەندییەکی هۆداری یەکلایەنانەش لەنیوان ئەم (قۆناخە)و رەهەندەکانی بەرهەمهینان یان گیجە جۆراوجۆرەکـانی چـالاکیی ئـابووریی کۆمـەلگا مرۆییـەکان لەگۆڕێدا نییە. لیرەدا تاقە مەبەستی دەستنیشانکردنی ئەو چوار قۆناخە میژووییە کە یەك لەدوای‌یەك بەدەوری تەوەرەی چوار وتەزای (سیحر)، (ئوستوورە) (میتافیزیك)و (زانست و تـەکنۆلۆژیا)دا سوور دەخۆنـەوە—روونترکردنـەوەی بەلگاندنـە

ئالۆزەکانی نووسەرانی دیالکتیکی رۆشنگەرییە؛ هەر بەم بۆنەشەوە هەرگیز نابێ جیاوازییەکەی لەگەڵ خودی بەلگاندنەکەدا وەپشت گوێ بخرێ (لەدوابەشی ئەم نووسینەی بەردەستدا تیشك خراوەتە سەر لیکدانەوەی ئەم جیاوازییەو هەروەها بابەتگەلی پیوەندیدار بەماناو گرنگایەتیی شیوە گیرانەوەکەی ئادۆرنۆو هۆرکهایمر).

قۆناخی یەکەم، واتە پیش میژووی سووژە، هەمان پیش میژووی مرۆییە. مەتەلی (سەرەتا)–سەرەتای زمان‌و کۆمەلگاو زانیاریی‌و هتد– گرنگترین خاڵ لەوەسفی ئەم قۆناخەدایە، چونکی هەر هەولیك بەمەبەستی تیگەیشتن‌و روونکردنەوەی ئەم (سەرەتا)یە لەسەر بناخەی هەر چەشنە هۆداریتییەکی (میژوویی) خۆی لەخۆیدا جۆرێ لەو (دیاریکردنی ئاکامەکان بەپیی ویستی خۆی)و بەدواوەیەو تەنانەت هەندێ دژایەتیی بەرچاویشی لێ ئەکەویتەوە؛ وەها هەولیك بەمانای چیکردنی چەشنێ ئوستوورەیە، لەبەرئەوەی کە ئوستوورەکان، لەبنەرەتداوبەراستی، بریتین لەهەوڵ‌و تەقەلا جۆراوجۆرەکان بۆ ئاراستەکردنی وەسفیکی گشتی‌و یەکدەست‌و هەمەگیر لە(سەرەتا). لەگیرانەوەکەی دیالکتیکی رۆشنگەریدا هەموو شتێ بەبچرانی مرۆڤ لەسروشت‌و سەرهەلدانی دوانەی سووژەو ئوبژەوە دەست پیدەکا. ئەم پچران‌و بەرامبەرینییەش زۆرتر لەریگەی دەرکەوتەو کۆبەندە هەرە گشتی‌و گرنگەکەیەوە، واتە هەست بەترس، هەلدەسەنگیندرێ.دوابەدوای پچران لەسروشت، جیهان بۆ

مرۆڤ دەبیتە کۆمەلیکی ئالۆز لەهیزە نەناسراوو ویرانکەرەکان. بەپیچەوانەی بوونەوەرەکانی دیکە، کە بەردەوام لەکاتی ئیستادا دەژین، وینەگەلی رابردوو (مەرگی باووباپیران)و داهاتوو (مەرگی خۆی) بەردەوام لەمیشکی مرۆڤدا ئامادەبوونیان هەیە. لەگیرانەوەکەی ڤیکودا وەدیارکەوتنی بابەتیانەی ئەم ترسە، واتە ناشتنی مردوو، بەراستی بەیەکەم دامەزراوەی کۆمەلایەتی و سەرەتای بەدیهاتنی کۆمەلگا دادەنریّ.

لەناخی ئەم دابرانەو ترسی دوای ئەم دابرانە دابوو کە خودیکی تاکی و هۆشیار سەری هینایەدەریّ.

ئەنرژیی دەروونیی پاش ئەم ترسە بەردەوامە بووە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ بەسەر سەرکەشیی سروشتی ناوەوە یان هەمان (غەریزە وەحشییەکان)دا زالّ بیّ. مرۆڤەکان بۆ بنیاتنانو گیرساندنەوەی ئەم خودە تووشی زۆر بەلاو ناحەزی؛ بەوتەی ئادۆرنۆو هۆرکهایمر، هەر کام لەئیمە لەسەردەمی منداليتيدا هەر ئەم رووداوە ترسناکەی جیایی لەجیهان، زالبوون بەسەر (غەریزە)دا، ئاگاداری لەتاکیتی و ئیشی بلۆق-بەچاوان دیتووە. هەلبەت سەرلەبەری ئەو خالانەی لەسەرەوە بەشیوەیەکی جیاجیا ئاماژەیان پیکرا (و لەگەلّ زۆریکی تردا) هەر تەنیا رەهەندگەلی جیاواز، بەلام جیانەکراوی، یەك واقیعن، خود لەپیشدا وەکو وتەزایەکی کۆمەلایەتی بیچم ئەگریّو دەوامو مانەوەی کۆمەلگاو یاساکانیشی لەگرەوی سەقامگیریو پاراستنی خودە تاکییەکاندایە.

بەوتـەی نیچـە (لەرەچەلەکناسـیی ئاکـاردا)، دوابـەدوای پچـران لەسروشـت، مـرۆڤ وەکـو بوونـەوەریکی کـەم هــیزو بیبەش لەچنگ‌و دوان، ناچار ما بۆ مانەوەی خۆی پەنا بباتە تـەنیا چـەکی خـۆی، واتـە ئـەقڵ. ئـادۆرنۆو هۆرکـهایمەریش بەچاوبرین لەنیچەو فرۆید، (ئەقل)یان وەکو لایـەن یـان بەشـی دەرهەسـتکراوی هـیزی غـەریزەو خـودی ناهۆشـیارو نەسـتی مرۆڤ دادەنا کە هـەر لەسـەرەتاوە وەکو ئامرازی پاراسـتنی خــود لەشــەر لەگــەڵ سروشــت (ی نــاوەوەو دەرەوە)دا بەکارهینراوە.[١٠] گرنگترین ئاکـامی بەرامبـەریتیی سـووژەو ئوبژەخواسـتی گەرانـەوە بۆ باوەشـی (دایکـی سروشـت) بـوو، بەلام بێ دۆراندنی خودی تاکی‌و جیاوازییەکـەی لەجیـهان. ئیـدەی (بەهەشـتی ونبـوو)و (سـەردەمی زیرینـی یـەکیتیی مـرۆڤ‌و سروشــت)و هــەروەها تـرس لــەونکردنی خــود لەسروشـتداو گەرانــەوە بــۆ قۆنــاخی حــەیوانی بەراســتی هەردووك کۆنکترین بابەتگەلی ئاگایی‌و هۆشیاریی مرۆڤ پیك دینـن کـە جیّپەنجـەیان لـەناو زۆریـك لەئوسـتوورەو بـاوەرە نەتەوەییەکاندا دیارە.

بـەلام ئەگـەر شیمانەی گەرانــەوە بـۆ سروشـت لـەگۆریّدا نـەبیّ، ئـەوە بـۆ زالبـوون بەسـەر جیـایی‌و بەرامبــەریتی‌و هەروەها ترسی دوای ئەمانە هەر تەنیا یەك ریگە ئەمینیتەوە: دابەزاندنی سروشت بۆ خودی مرۆیـی (واتـە، هـەمان سووژە یـان زەیـن)و گواسـتنەوەی کۆمەلـە ئـالۆزەو ناریکوپیکـەکانی (سروشـت) بۆ چەمکە گشـتی‌و یەکدەسـت‌و یـەکگرتووەکانی

زەین. گواستنەوەی هاماوی جیهان بۆ زەینییەتی مرۆیی، بناخەی هاوبەشی ئوستوورەو میتافیزیكو ئەقلی رۆشنگەری پیك دینێ. ئەم گواستنەوەیە پیش مەرجی دەسەڵاتداریتی مرۆڤ بەسەر سروشتو ئەمئەوەكیی سووژە لەگەڵ ئوبژەدایە، كە بەنموونەی سەرەتایی سەرجەم شیوەگەلی زانیاری–عیرفانیو فەلسەفیو زانستی–ئەژمیردرێ. لەم روانگەیەوە، بابەتی (ناوەندیتی زەین)و (مەلبەندیتی مرۆڤ یان تەوەری) بابەتیكە هاوتەمەن لەگەڵ دریژایی خودی میژوو.

بەڵام بەرامبەریتیی سووژەو ئوبژەو هەولی مرۆڤ بۆ دەسەڵاتداریتیی بەسەر سروشتی ناوەوەو دەرەوەدا، جگە لەپاراستنی خودو گۆرینی سروشت بۆ بابەتیتییەكی رەها، ئاكامگەلیكی دیكەشی بەدواوەوە بوو. كۆمەلگا كە بریار وابوو مرۆڤ لەژیر ركیفی هیزو یاساگەلی سروشت رزگار بكا، بۆ خۆی گۆردراو بوو بەسروشتیكی دووەمین كە بەسەربەستیو جیا لەهەر چەشنە چاودیرییەكی تاكی یان كۆییو بەنرخی قوربانیكردنی مرۆڤەكان بەردەوام لە(پیشكەوتن)دابوو. توانستو بەهرە ناوەكییەكانی مرۆڤ لەروالەتی پیوەندیو دامەزراوەگەلیكی بابەتانەو نامۆدا خۆیان بەسەر مرۆڤدا زاڵ كردو مرۆڤ، كە بریاربوو ئاغاو گەورەی جیهان بێ، گۆردراو بووبەچشتیك لەنیوان چشتەكاندا. ئامرازگەلی وەدەستهینانی دەسەلات بەسەر سروشتدا، وەك دابەشكاریی پیشە، خۆیان بەسەر سەرجەم

دامـەزراوەو پیوەندییـە مرۆییـەکاندا، لەبنەمالـەو عەشـیرەوە بگـرە تـا ریورەسمـــە کولتـــووریو ئایینییـــەکان، زالکـــردو دەسـەڵاتی مـرۆڤ بەسـەر مرۆڤداو گۆرینـەوەی توندوتیـژیو هیزو (دریژەدان بەمانـەوە) یـان کـرد بەقـەدەری ئوسـتوورەیی سەرجەم رەگەزی مرۆڤ.

هەلبـەت ئـەم رەوتـە پـەیتا پـەیتا و بەتیپـەرین لەچـەندین قۆنـاخی ســەرەتاییەوە ســەریگرت. بـەگویرەی گیرانــەوەی دیـالکتیکی رۆشـنگەری، لەسـەردەمی پیـش ئوسـتوورەداو، تەنانـەت بـەر لەسـەرهەلدانی گیانگـەریتی (animism) سـیحرو جادوو گرنگترین شیوەی ئەزموونو زانیـاریی مرۆیـی بـوون، نموونـــەی ســـەرەکیی بیریـــاریی جـــادوویی هـــەمان لاسـایی‌کردنەوە (مایمیسـیس)یـان هەلسـوکەوتی لاسـایی کـەرەوەیی (مایمـاتیك) بـوو کـە هاوکـات بەنموونـەی گەمـەو پیکـەنینو داهینـانی هونـەرییش دادەنـرا (هەرچـەندە لـەو سەردەمەدا هونەرو باوەرە ئایینییەکانو ژیانی کردەییو ژین هیشـتا لیکـدی جیـا نەکرابوونـەوە). هەلبـەت بەرامبـەریتیی سووژەو ئوبژەو هـەروەها ویسـتی کـارتیکردنو شـویندانان لەسـەر ژینگـە لەسیحرو جادوودا ئامادەبوونیـان هەیـە؛ بـەڵام لـەم قۆناخـەدا هیـچ نیشـانەیەك لەخواسـتی دەسـەڵاتداریتیی سـووژە بەسـەر ئوبـژەداو یـەکیتیو ئەمئـەوەکیی ئـەو دوانـە لـەئارادا نییـە؛ چونکـە، بەوتـەی ئـادۆرنۆ، هەلسـوکەوتی لاسـاییکەرەوەیی هیـچ شـتیّ لاسـایی ناکاتـەوە، بـەلکو لەوشـتەدا خـۆی دەنوینیتـەوەو لـەناو ئـەچیّ.)[11] ئـەنجامی

هەرە گرنگی ئەم هەلسوکەوتە نزیکایەتیی زەینو عەین (واتە، ناسکارو بابەت)و وەدیهاتنی لیکچوونی نیوان ئەو دوانەیە؛ ئەمەش بەم مانایەیە کە زەین (واتە، سووژە) هەولدەدا لەریگەی نواندنو لاساییەوە (مایمیسیس)پیوەندییەکی بەتاڵ لەتوندوتیژیو دەسەڵات لەگەڵ بابەتەکەی (عەین) خۆیدا سازبکا. وەها تیروانینیك چەندین دەرئەنجامی گرنگی بۆ سووژەو ئۆبژە بەدواوەیە. لەهەلسوکەوتی لاساییکارانەدا بەردەوام بابەت (لەچاو زەینو ناسکار) بەباشتر دادەنریّ. هەلسوکەوتی لاساییکارانە دەبیتە هۆی رزگاربوونی چشتو بابەتەکان لەبەندی نفرتیی (چشتئاسایی)، کە بۆخۆی یەکیّ لەئاکامەکانی ئاوەزئامرازییەو، مۆلەتیان دەداتیّ تاکو ناوەرۆکی راستەقینەی خۆیان بەزمانیکی تایبەت بەخۆیان دەرببرن. ئەم زمانەش، بەراستی، بەسەرەتای سەرهەلدانی جوانیو، پیوەندیی ئەم جوانییە بەهەقیقەتەوە لەبەرهەمە هونەرییەکاندا لەقەلەم دەدریّ. سووژەش لەم ریگەیەوە مۆلەتی دەدریتیّ تاکو هەموو توانستە ناوەکییەکانی خۆی بەشیوەیەکی هاوساز بینیتەدی. سووژە، لەئاقاری گەمەو هونەردا، بەوەلانانی خواستی چەقیتیو لەریگەی لەسەرخۆچوونەوە (ecstasy) لەئاکامدا رزگاردەبیّ. کەیفو سەرخۆشیی دوای گەمەو راهینانو وەرگرتنی (تامو چیژی) بەرهەمە هونەرییەکان، کە لەویّ هیچ ناونیشانیك لەدیالکتیکی ویرانکەری پاراستنو لەناوبردنی نابیندریّ، خۆی لەخۆیدا پیشاندەری هەمان ئازادیو رزگاری لەترسە.

بەڵام تا ئەو شوێنەی پەیوەندیی بەسیحرەوە هەبێ، گرنگترین دەرئەنجامی ئامادەنەبوونی بابەتی دەسەڵات ئەوەیە کە هیچ پێویستییەك بۆ (دەرهەستکاری) لەگۆڕێدا نییە. جادووکار یان ساحیر بابەتەکەی خۆی پیشان ناداتەوەو، هەر لێرەوەیە کە، پێویستی بەچەمکە گشتیو دەرهەستەکان نییەو، سەرنجیشی یەکسەر لەسەر خودی بابەتەکەو تایبەتمەندییە پەراوێزیو بەرهەستەکانی کۆکراوەتەوە، هەر بەم بۆنەوەیە کە لەروانینی جادوویی‌دا بەردەوام ناوگەلی تایبەتیی چشتەکانو شتە بەرهەستەکان، وەك موو یان نەیزە، گرنگایەتیی زۆریان هەیە.

جەوهەری مێژوویی جادوو و روانینی جادوویی لەشیکارییە تۆکمەکەی ئارنۆلد هاوزردا سەبارەت بەنیگارکێشیی سەردەمی دێرینەبەردی، (paleolithic، دووەمین سەردەمی چاخی بەرد)، ئاشکرا کراوەتەوە. ئەم وێنانە خاوەن تایبەتمەندییەکی سروشتیو زیندوو سەرانسەر ناتورالیستین کە بەراستی هیچ لێکچوونو نزیکایەتییەکیان بەشێوەکاریی منداڵان یان بەرهەمە دەرهەستو هێماییەکانی سەردەمگەلی دواییەوە (وەك چاخی نوێ بەردی) نییە. بەوتەی هاوزر، وێنەی خەیاڵکرد یاخود ئەو هەستەی کە ئەم بەرهەمە ناتورالیستیانە ئاراستەی دەکەن هێندە سەر راستو خاوێنو بەتاڵ لەهەر چەشنە دەستکارییەکی فیکرییە کە هەر تەنیا لەشێوەکاریی ئەمپەرسیۆنیستیی مۆدێرندا شتی وا وەبەرچاودەکەوێ.[١٢]

ئەم بەرهەمانە هی سەردەمیکن کە نیچیرو راو گرنگترین شیوەی ژیان بردنە سەر بوو، سەردەمی سەرهەلدانی جۆرێ (تاکیتیی سەرەتایی)و ژیانی کۆیی وئۆرگانیزەنەکراوو ئازاد. سەرومری بەلگەو نیشانەکان پیکەوە لەخۆگری ئەو خالەن کە لەم سەردەمەدا هونەر لەبنەرەتدا (ئامرازیك بۆ جۆرێ تەکنیکی جادوویی بووەو لەم پیگەیەشدا کارکردنیکی یەکجارکردەیی هەبوو کە بەتەواوی لەپیناو وەدیهینانی مەبەستە ئابوورییەکاندا هەلسوکەوتی دەکرد.)[١٣] ئەم شیوکارییانە بەراستی چەشنێ ئامراز یان (داو)ی جادوویی بۆ بەدواخستنی بوونەوەرەکان بوو، چونکی بۆ مرۆڤی ئەو سەردەمە شیوەکاری یان وینە (هەم نواندنەوەو هەم شتە نویندراوەکە بوو.) بۆ نموونە، کردەی تیرخستن لەکەوانەوە بەرەو وینە بوو کە تەکنیكو مەبەستی جادوو، واتە راوو نیچیری، وەدیئەهینا، نەك جۆرێ لەهزرو ئەندیشە یان بیروباوەری زەینی. رەسمکردنی ئەم شیوەکارییانە بۆ خۆی بەشیکی هەرەگرنگی رەوتی راوکردنو، کەواتە، کردەیەکی مەبەستدار بوو، نەك جۆرێ کارکردو ریورەسمی هیمایی کە ئەبێ (جینیشین)ی چالاکیی کردەییو راستەقینەی راوبێ. لەوکاتەدا هونەر هیشتا سەرانسەر لەخزمەت ژیاندا بوو و، خاوەن هەر چەشنە دەوریکی (رازینەرەوەیی)و (هونەری) نەبوو (بەو شیوەیەی ئەورۆکە بەکارئەبرێ). ئەمەش کە ئەم وینەگەلە زۆربەی کات لەسووچو قوژبنە تاریكو دوورەدەستەکانی ئەشکەوتەکاندا رەسمو بەراستی نهینی

کراون دیسانەوە پیشاندەری هەر هەمان دیدو بۆچوونە. مەبەست لەرەسمکردنی ئەم وینەگەلە قەبارەو ئەندازەیەکی یەکجار سروشتیو راستەقینەدا داهینانی نموونەیەکی دیکە بوو کە مەشیایە دەربر یان لاسایی نموونەی سەرەکی ببوایە؛ هەلبەت ئەم شیوە (نواندنەوە)یە، کە ئاماژەو هیماسازیو ساختەکاری ناچنە ناو مەبەستەکانیەوە، (نەیدەتوانی شتێ جگە لە(نواندنەوەی) ناتورالستی بێ.)[١٤]

سەرهەلدانی گیانگەریتی لەسەردەمی نوێ بەردیدا بەمانی دەستپیکی دەرهەستو زەینی بوونی واقیعو دابەشکردنی جادوو بەسەر بوارە جیاجیاکاندا وەك هونەرو پیشەو ئوستوورەو..هتد بوو. لەم ساتەوەختە بەدواوە، نواندنەوەی وردو بەکاوەخۆو چالاکی سروشت کە زیاتر سەبارەت بەبابەتە بەرهەستەکان بوو جیگەی خۆی بەخشییە (نیشانە شماتیكو بریارییەکان) کە (هەروەك خەتی هیروگلیف، لەجیاتی بەرهەم هینانەوەی ئۆبژە یان بابەت، ئەوەیان پیشاندەدا.)[١٥] هەنووکە (واتە، لەو قۆناخەدا) هونەر هەولدەدا لەبری ئەزموونی زیندوو و هەستپیکراوی مرۆڤ دەربارەی چشتەکانو جیهان، (ئیدەو چەمكو جەوهەری ناوەکیی چشتەکان) وەچنگ بخات. لاساییکردنەوەی ئوبژەو نزیکایەتی لەگەلی جیگەی خۆیدا بەئافراندنی هیماکان. (وینەو نموونەگەلی سەردەمی نوێ بەردی هەر تەنیا لەریگەی بەکارهینانی دوو یان سێ رەسمی ئەندازەییەوە ئەندامانی لەشی مرۆڤیان پیشاندەدا.)[١٦].

داهینـانی ئـەم هیماگەلـەو بـەگیاندار زانینـی سـەرجەم چشـتو بوونـەوەرەکان-واتـە، بەخشـینی تایبەتمەندییـە مرۆییەکان بەوان، وەك زانیاریو زەینییەت- یەکەم هەنگاوی گرنگ لـەپیناو دابـەزاندنی ئۆبـژە (واتـە، عـەینو بابـەت) بـۆ سـووژە (واتـە، زەیـنو ناسـکار)و دەسـەڵاتداریتیی دووەمـی بەسـەر یەکـەمیدا بـوو. بەدیـهاتنی ئـەم ئامانجـە پیویسـتی بەسـەرکوتو بـەرەوبرکردنی هـەر چەشـتە نـەبوونی ئەمئـەوەکیو قوربـانیکردنی بابەتـە بەرهەسـتەکان لەبـەردەم شـتە گشـتییەکانداو، توانـەوەیان لەچەمکـە گشـتییە زەینییەکاندایـە. هیماگـەلی گیانگـەریتیش لـەئاکامدا بـوون بـەقوربانیی وەهـا لـەناوچوونو توانەوەیـەك. هـاوزر بەرامبـەریتیی جـادوو و گیانگـەریتی بـەم شـیوەیە وەسفدەکات: (دیدی جادوویی بۆ جیهان مۆنیستییەو، واقیع لەروالـەتی یـەك تـەنراوی سـاکارو بـەربڵاوو پیکهاتەیـەکی یـەکگرتووو بیپچـران سـەیر دەکـا؛ بـەڵام گیانگـەریتی دوولایەنانـە (دوالیسـتی)یـەو زانیـاریو باوەرەکـانی خـۆی لەروالەتی سیستەمیکی دوو جیهانیدا دادەریژریو بیچمیان دەداتێ.

جـادوو روانینیکـی هەسـتئامیزە کـە تیکـەڵاوی شـتە بەرهەستەکان دەبێ؛ بەڵام گیانگەریتی روانینیکی مینۆکییەو بەرەولای (دەرهەستکاری) دەشکیتەوە. لەدۆخی یەکەمدا بیرو ئەندیشە لەسەر ژیـان لـەم جیهانـەدا بنیـاتنراوەو، لـەدۆخی دووهەمدا، لەسەر ئەو جیهانەی کە دیت. هەر بەم بۆنەشەوە،

لەهونەری سەردەمی دیرینە بەردیدا چشتەکان راست وەك ژیان و واقیع بەرهەم ئەهینرینەوە، لەکاتیکدا کە هونەری سەردەمی نویٚ بەردی جیهانیکی باشتری یاسامەند و ئارمانگەرا (idealized) لەهەمبەر واقیعی ئەزموونی ئاساییدا دادەنیٚ.)[١٧]

هەلبەت ئەم وەسفەش خۆی لەخۆیدا تارادەیەك گشتی و دەرهەستە. هاوزر ئەو راستییەی وەپشتگویٚ خستووە کە بیرو روانگەی تیۆلۆژییە وەحیانییەکان لەمەر ژیانی دوای مەرگ و هەستانەوەی جەستەیی (لەقیامەتدا)، لەچاو تیۆرگەلی فەلسەفەکارانی یۆنانی کۆن سەبارەت بەهەرمانیی رۆح، لەخۆگری چەندین توخمی مادی و بەرهەستە. هەر بۆیە نابیٚ وەسفەکەی هاوزر دەربارەی بەرامبەریتیی دوو روانگەی ئەم جیهانی و ئەو جیهانی وەکو ریسایەکی گشتی دابنەدریٚ کە(گوایە) بەکارهینانی، دەبیتە هۆی باشتر تیگەیشتنی گۆرانکارییەکانی سەردەمگەلی دوایی. هەلبەت سەرەرای ئەمە، شیکارییەکەی هاوزر لەمەر رەوتی دەرهەستبوونەوەی ئەزموونی مرۆیی و، بەتایبەت ئاماژەکەی بۆ هیرۆگلیف، راست و بەجییە. لەمیسری کۆندا گەشەکردنی تایبەتمەندییە دەرهەست و ریسامەند و هیماییەکانی بەرهەمگەلی کولتووری، پیوەندییەکی راستەوخۆی لەتەك سەقامگیریی زنجیرە قۆناخە کۆمەلایەتییەکان و مسۆگەرکردنی دەسەلاتداریتیی رەهای فیرعەوندا هەبوو. سەرلەبەری ئەو خالانەی سەرەوە لەگۆرانکاریی میژوویی خەتی هیرۆگلیفدا دیارە. ئەم خەتە،

کـە مـافی خوێندنـەوەو بـەکارهێنانی هـەر تـەنیا تایبـەت بـەچینێکی بـالاو بـەرچاو بـوو، بـەئامرازی گرنگـی پتەوترکردنەوەو پەرەپێدانی هێزی پاوانخوازانەی فیرعەون‌و فالگرەکان ئەهاتە ئەژمار. بێگومان توانا بەرزو هونەرییەکانی شارستانیتیی میسر لەهێنانە ژێر رکێفی هێزە سروشتییەکان (وەك کۆنـترۆلی رووبـاری نیـل‌و چێکردنـی ئـەهرام‌و..)و شـەرعی‌و یاسـامەندبوونی دەسـەلاتی کۆمەلایـەتیی حوکمـداران‌و هـێزی کولتووریـی ئوسـتوورە نابـێ‌و نـاکرێ لـەرەوتی پێشـکەوتنی خـەتی هـیرۆگلیف جیابکرێتـەوە. سـەرهەلدانی ئـەم خەتـە دەسـتپێکی جیـایی وشـە لەوێنـەو هەروەهاسـەرەتای ئامرازی‌و دەرهەستبوونی زمانە. هاوکات لەگـەڵ سـەرهەلدانی خـەتی ئـەلفوبێی‌و سیسـتەمی نیشـانە هێماییەکان (هوبووت یان هاتنەخواری زمـان)یـش کـامڵ بـوو. وشە بوو بەئامرازی ناسین‌و چاودێری ئەقلانی، لەکاتێکدا کە وێنـە سروشـتێکی غـەریزی‌و دژە ئـەقلانیی وەدەسـت هێنـا. وشە گۆردراو بوو بەزانست‌و وێنەش هـەر بەهـەمان شـێوە، گۆردراو بوو بەهونەر. جیایی ئەم دوانە لەیـەکتر واقیعیکـی مێژووییە، کە نکوولی لێکردنی بەردەوام بۆتە هۆی نادیاری‌و لێلـی سـیمای راسـتی‌و هەقیقـەت. پێداگریـی تیۆلۆژییـە وەحیانییـەکان لەسـەر (هەقیقـەتی بێوێنـە)و بـەرەوبرکردنی وێنەسازیی هـەق (واتە، خواوەند) هـەر لەسـەر ئـەم بناغەیـە دامـەزراوە. تـەنیا ئاکـامی چاوپۆشـیکردن لـەم (شـتە) بەرەوبرکراوە گەرانەوە بۆ ئوستوورەو گەشەکردنی دەسەلات

بوو؛ هێزی ئوستوورەیی سینەما، وەکو خەتی وێنەیی یان هیرۆگلیفی مۆدێرن، پێشاندەری ئەم بابەتەیە.

گیانگەریتی گیان دەبەخشێتە چشت و بوونەوەرەکان، لەکاتێکدا ڕۆشنگەری مرۆڤ گیاندارەکان دەکاتە چشتگەلیکی بێگیان. پێوەندیی نێوان ئەم دوانە، دەرکەوتەیەکی دیکەی دیالکتیکی ڕۆشنگەرییە کە لەسەردەمی نوێدا دووبارە دەبێتەوە: لەو ساڵانەدا کە کانت هەولی ئەدا زانستی نیۆتۆنی وەکو زانیارییەکی بابەتیانە بناسێنێ، ڕۆمانتیکگەلی سەرشێتی هونەر، شێلگل و نۆڤالیس، لەتیۆرە مەعریفییەکەی خۆیاندا باسیان لەزیندووو بەئاگابوونی هەموو چشت و بوونەوەرەکان و یەکیتی نیوانیان لەرێگەی ئامادەبوونی ڕۆحی زیندووی سروشتەوە (واتە، مانا) دەکرد.[١٨]

لەگێرانەوەکەی ئادۆرنۆو هۆرکهایمردا گیانگەریتی سەرەتای چوونە ناو قۆناخی دووەمی پێش مێژووی سووژەیە. لەم قۆناخەدا دەسەڵاتی تەکنیکی بەسەر سروشتدا بەستێنێ بۆ سەرهەلدانی ژیارو کولتووره کۆنەکان خۆش کردووە. گێرانەوە ئوستوورەییەکان دەربارەی بەدیهێنانی جیهان (و مرۆڤ) بابەتی یەکیتیبەخشی کولتووری ئەم گۆمەلگایانە پێک ئەهێنێ و نموونەی سەرەتایی و سەرچەشنانەی (archetypal) بنەما کۆمەڵایەتیی و سیاسییەکانیانە.

گیرانەوەگەلی ئوستوورەیی بەهۆی تایبەتمەندییە گشتیو ریکوپیکو یاسا مەندەکانیانەوە بەراستی بەیەکەم هەنگاو لەپیناو وەدەستهینانی دەسەلاتی ئەقلانی بەسەر سروشتی ناوەوەو دەرەوەدا دادەنرین.

لەم قۆناخەدا دەمیکە لایەنی بەرهەستو لاساییکارانەی جادوو لەبیرچۆتەوەو جیگەی خۆی داوە بەزنجیرەیەکی ئالۆزو پیچراو لەریورەسمە ئایینییەکان هاوکات لەگەل پەرەسەندنی دابەشکاریی پیشە جادووش روالەتیکی (پسپۆرانە) لەخۆئەگریٚ؛ لیرەدا ئیدی لەهاوکاریی جەماوەری ئاسایی لەریورەسمە جادووییەکاندا هیچ ناوونیشانیك لەئارادا نییە، بەلکو، بەپیچەوانەوە، پسپۆرانو ئەندازیارانی جادوو، واتە فالگرو غەیببیژان بەئاشکرایی جادوو وەکو ئامرازی پیشاندانی هیزو وەچنگ خستنی دەسەلات لەقەلەم دەدەن؛ ئەویش نەك هەر دەسەلات بەسەر مرۆڤەکانی تردا، بەلکو دەسەلات بەسەر سروشتو جیهاندا– (بیگومان ئەگەر کاهین قوربانی نەدەکرد، خۆرەتاو هەلنەدەهات.) لیرەدا جادوو هەمان ئامرازە کە لەکاتی بەکارهینانیدا هیزو زانیاری دەبنەیەکیٚ. هەربەم شیوەیە، وینەو هیما نادیارو ئالۆزەکانی گیانگەریتی جیگەی خۆیان دەبەخشنە چەمكو ناوە دیارە ئوستوورەییەکان. بەهۆی بەکارهینانی ریسای (ئەمئەوەکی)یەوە هیزە نەناسراوەکانی سروشت، لەروالەتی خوا گەلی چەشنو بوونەوەرە ئوستوورەییەکاندا، ناونیشانو شوناسیکی نەگۆر وەدەست دینن. هەر ئەمەش هاتوچۆو گۆرینەوەو لەئەنجامیشدا کۆنترۆلی ئەم هیزانەی بەدواوەیە.

لەئاییینی هیندوودا فراوانیی بوونەوەرە سروشتییەکان (ئۆبژەکان) هەر تەنیا لەناو بیچمەوە هاتۆتە دی، چونکە هەموو شتێك هەر تەنیا ناوو بیچمە. بناخەی یەکەو یەکگرتووی ئەم زۆرینەیی و فراوانییە هەمان (برەهمەن) یان (کاهین)ە کە لەروانگەی هەقیقەتی سەرەکییەوە لەگەڵ رۆح و خودی مرۆیی یان (ئاتمەن)دا (واتە، سووژە) بەیەکسان دادەنرێ. لێرەدا جەوهەری راستەقینەی روانینی ئوستوورەیی، واتە یەکگرتنی هەموو چشتەکان لەرێگەی دابەزاندنیانەوە بۆ هاماویکی گشتگیرو زەینی، بەشیوەیەکی کەم تا زۆر هۆشیارانە دەرك دەکرێ و دەرئەبردرێ. ئەکرێ ئەوەش پیشان بدرێ کە سیستەمە ئوستوورەییەکانی دیکەش هەمدیسان لەم لۆژیکە ناوەکییەوە پەیرەوی دەکەن. هەلبەت لیرەشدا رەهەندەکانی دیکەی روانینی ئوستوورەیی–وەك وەدەستهینانی دەسەڵات بەسەر سروشتدا، دابەشکاریی پیشە، بیچم گیریی زنجیرە قۆناخە کۆمەڵایەتییەکان و..هتد– بەناچار خۆیان وەدەردەخەن.

لەدیالکتیکی رۆشنگەری‌دا حەماسە بەناوبانگەکەی هۆمیر، ئودیسە، لەهەردوو لایەنی دەسەڵاتداریتی بەسەر سروشتی دەرەوەو ناوەوەدا خراوەتە بەر تیشکی هەلسەنگاندن و پیداچوونەوە. لەحەماسەکەی هۆمیردا هەردوو لایەن لەپیوەندی لەگەڵ یەکتردا پەرەدەستینن و، بەم بۆنەوە، بەهەردوو شیوەی عەینی و زەینی (واتە، بابەتیانەو ناسکارانە)دەرئەبردرین. پالەوانی ئوستوورەکە، ئودیسووس،

ئـەبێ بەیارمـــەتی بـیرتیژیو ئـــەقلی خـــۆی بەســـەر هـــێزە ئوســـتوورەییەکاندا ســـەرکەوێ، هـــەمان ئـــەو هێزانـــە کـــە خوازیـاری کۆیلایـــەتیو لـــەناوچوونی ئـــەون، بـــەڵام بابـــەتی دەسەڵاتداریتی بەسەر سروشتی دەرەکیدا، ویرای زەینییەتی پالەوانەکـە، بەشـــێوەیەکی عـــەینی، واتـــە لەبنـــەمای خـــودی ئوستوورەکەدا، رەنگ دەداتەوە. ئودیسە وینەیەکی گشتیو ئەقلانی لەجیهان رەسمدەکات. ئەم بەرهەمە وەســفیکی ورد لەزەریای مەدیترانەو دورگەو کەنارەکانی پیشاندەدا؛ هەمان ناوچەکـە لـەبۆچوونی مرۆڤـی ســەردەمی یۆنـانی کۆنـــەوە بەهەمان (جیـهان) دادەنـرا. هـەر بـەم شـێوەیە، (نەناسـراوی گـەورە) بەیارمـەتیی نـاووبیچم بـۆ هامـاویکی ریکوپیـك یـان هەمان کاسمۆس (Kosmos) ئەگۆردرێ. ئەم هاماوە لەخۆگری هـــەموو شـــتیکە، لەخواکانـــەوە بگـــرە تـــا مـــرۆڤو چشـــتە مادییەکان. لیرەدا، جیهان لەکۆمەلیك لەبوونەوەرە ئاشکراو دەسـت نیشـانکراوەکان پیکـدێ کـە هـەر کامـەیان لـەزنجیرە قۆناخـەکان یا لەگەورە زنجـیرەی بوونـدا جیگـەو پیگەیـەکی تایبـەتیان بـۆ تـەرخانکراوە. ســەرلەبەری ئـەم بوونەوەرانــە، تەنانەت خواکانیش، لەیەك بنەواشەیبنچینەیی، واتە هەمان قـەدەریان بەرابـــەریی ئوســـتوورەیی (Dike) یـــان سیســـتەمی کیـــانی (کـــاسمۆس) پـــەیرەوی دەکـــەن. ئودیســـە، وەك دەرکەوتـــەی زمـــانیو ئـــەدەبیی ئـــەو سیســـتەمە، بـــۆ خـــۆی هامـاویکی حەماسـییە کـە سـەرجەم پاژەکـانی ژیـان، یـان بەوتەی هیگل، (تـەواوەتیی بوونـەوەرەکان)ی لەبنـەمای ئەلقە ئەلقەیی خۆیدا کۆکردۆتەوە.

هـەر هـەمان توخمـی بینینـی پانتـایی ئاسـۆیی ژیـان لەروالـەتی وینەیەکی پـانۆرامیکدا، کە تایبەتمـەندیی هـەموو بەرهەمە حەماسییەکان پیکدینێ، هەر لەئودیسەی هۆمیرەوە بگـرە تـا شـەرو ئاشـتی تۆلسـتۆی، بـەهۆی ئـاوا دیـدو بۆچوونیکـــەوە هاتۆتـــەدی. ئودیســـە وەســـفیکی ورد لەجوگرافیای سروشتیی (جیهانی مەدیترانە) ئاراستە دەکات: جیگـەو شوینگەی دورگـەکان، دریژایـی هاتوچۆکـان، شـەپۆلە زەریاییـەکان، چۆنایـەتی و قوولاییـی کـەنارەکان و..هتـد. هـەروەهاش، کۆمـەلیك زانیـاری دەربـارەی جوگرافیـای کولتووریو مرۆڤناسانە لەم بەرهەمەدا بۆتە هۆی کاملبوونی جوگرافیـا سروشـتییەکەی. هەلبـەت ئاشـکرایە کـە ئودیسـە وەکـو جـۆریّ (رینوینـی گەمیـەوانی و بازەرگـانی لەناوچـەی مەدیترانەدا) نەنووسراوە–هەرچەندە ویدەچیّ بۆ تاقمیك وەها دەوریکـی گیرابـیّ– بـەلام راسـتییەکە ئەوەیـە کـە ئـەم حەماسـەیە، بەوینـەی جـۆریّ پـلان هـەلگرتنی ئـەقلانی لەجیهان، هـەر لەسـەرەتاوە چەشـنی رۆشـنگەری و هـەولدان بووە بۆ زالبوون بەسـەر تـرس لەنەناسـراوەکان. سروشـت و چییـەتیی ئـەقلانیی و ئامرازی و دەسەلاتخوازانەی ئـەم هەولـە بۆ ئەوانـەی کـە هیشتا شیت و شـەیداو گـیرۆدەی ئوسـتوری زانستی مۆدیرن نەبوونە لەرۆژ ئاشکراترە.

بـەلام تا ئـەو شـوینەی پیوەندیـی بەلایـەنی دووەم، واتـە دەسەلاتداریتیی بەسەر سروشتی ناوەکییەوە هەبیّ، هەر کام بەو رووداوانەی بۆ ئودیسووس دیتە پیشیّ بۆ خۆی دەربری

قۆناخیك لەقۆناخەكانی بیچم گیریی و بنیاتنانی شوناس یان ئەمئەوەكیی خودە كە لەریگەی زالبوون بەسەر (غەریزە)وە دیتەدی. (ئودیسووسی فیلزان و بیرتیژ لەدوای تەلیسمە گیانگەرییەكان و هیزە ئوستوورەییەكان خۆی دەرباز دەكا؛ ئەو بەپەیرەویكردنیكی سەرپییی لەو قوربانیانەی كە لەباری ئاینییەوە پیوست بوو قوربانی بكرین لەوان پاریز دەكا.)[19] ئودیسووس بەمەست بەسەرسنگی خۆیدا دەكوتێ و لەدلی خۆی دەخوازێ تاكو بوردبارو كاوە خۆبێ. دەسەلاتداریتی ئەقلّ بەسەر غەریزەداو خستنە ژیر ركیفی لەزەت و پەروەردەكردنی خود لەگەلّ بارودۆخە شوینی و كاتییەكاندا تیكرا پیش مەرجی هەلسوكەوتی ئەقلانی و دوور ئەندیشی و پالپشتی پاراستنی خودن. مرۆڤ بەمەبەستی هینانە ژیر ركیفی سروشتی دەرەكی پیویستە سروشتی ناوەكیی خۆی سەركوت بكات و، ئەمەش، واتە (Subjection)، مەرجی هەرە پیویستی بیچم گیریی خودی ئەقلانی (subject) پیك دینێ. (خود) دەرئەنجام و بەرهەمی ناوەكیكردنەوەی هەمان توندوتیژییەكە هەر هەمان (خود) بەسەر سروشت و خودەكانی دیكەدا دایدەسەپینێ. (كەواتە) میژووی ژیارو شارستانیتی لەناخی چەشنی بەكارهینانی توندوتیژییەوە هەلدەستێ كە مرۆڤەكان و سروشت بەیەك ئەندازە دوچاری دین. مەكینەی سەركەوتووی رۆحی ئامرازی بەهەمان ئەندازە پیشاندەری میژووی ناوەكیكردنەوەی ریورەسمی قوربانیكردنە (یان، بەواتایەكیتر، میژووی پاراستنی خود)

که دەربری میژووی پەرەسەندنی هیزەکانی بەرهەم هینانە. رەنگدانەوەی ئەم پیوەندییە دوولایەنەی نیوان کۆنترۆلی تەکنۆلۆژیك و دەسەلاتی ئۆرگانیك لەخوازەی سەروەری و ئاغایی‌کردن بەسەر سروشتدا هەر هیشتا دیت گوێ: سەروەری‌کردن بەسەر سروشتدا لەتوندوتیژیی مرۆڤ لەسەر مرۆڤ که بۆ ناوەوەی نەستی خۆی فریدراوە (introjected) و لەو توندوتیژییەی کە بەسەر سروشت و چییەتی خۆیدا دایدەسەپینێ جیاناکریتەوە.)[20]

لیرەشدا بیچم گیریی ئوستوورەیی خود لەپیشدا بۆ خۆی جۆرێ لەرۆشنگەرییە، هەروەك چۆن ئیدەکانی سەردەمی رۆشنگەری سەبارەت بەسەرهەلدانی کۆمەلگاو خود لەسەر ئوستووره گەلیك وەك (مافە ئاساییەکان) و (بریاری کۆمەلایەتی) دامەزراوە کە مەشیایە روونکردنەوەیەکی زانستییان لەتەبایی کۆمەلایەتیی مرۆڤە خۆئایینیەکان وەدەست بدایە. هەر بەم شیوە، لەسەردەمی کەوناراشدا دیالکتیکی گۆرینەوەو دەرهەستکاری یان ئەمئەوەکی و دەسەلات لەئاستیکی سەرترو گشتیترو لەروالەتی ئوستوورەدا دەمینیتەوە.

بەردەوامیی رەوتی دەرهەستبوونەوەو پەرەسەندنی بنەواشەی دەسەلات لەسەرجەم رەهەندەکانی ژیانی تاکی و کۆییدا لەئەنجامدا بووە هۆی ئوستووره لابەری و کران لەئوستووره. ئوستووره بەهۆی پیشکەوتنە دیالکتیکەکەیەوە بەستینی بۆ سەرهەلدانی زاتی سەلبی خۆی سازکرد، کە

هەمان بیریاری‌و کردەی ئەقڵانییە. بیریاریی ئەقڵانی لەیۆنانی کۆندا لەرواڵەتی ژمارەیەك لەگوتارە تیۆریکەکاندا هاتە دی کە فەلسەفە بۆ خۆی یەکێك لەوانە بوو. هاوکات لەگەڵ فەلسەفە هەندێ گوتاری دیکەش وەك زانستە ماتماتیکییەکان (ئەندازە)، زانستە سروشتییەکان، مێژوو (هێرۆدۆت‌و ئوسیدید)، گوتەبێژی‌و رامیاریی سۆفیستەکان‌و..هتد سەریان هەڵدا. (لابردنی ئوستوورە) یان (ئوستوورە سڕینەوە) لایەنی هاوبەشی هەموو ئەو گوتارانەی پێك دەهێنا، بەڵام لەروانگەی دیالکتیکی رۆشنگەری-یەوە ئوستوورە سڕینەوە خۆی لەخۆیدا وەکو قۆناخێك لەبەدیهاتنی جەوهەری راستەقینەی ئوستوورە دێتە هەژمار: دەسەڵاتی سووژە بەسەر ئوبژەدا. بێگومان فەلسەفەی میتافیزیکی نموونەو ئیدەی سەرەکیی ئەم قۆناخە پێکدێنێ کە بەقۆناخی سێیەم ناوزەد ئەکرێ. هەر بەم بۆنەشەوە، دەربازبوون لەوینەو وتەزا ئوستوورەییەکان‌و هەنگاوهەلگرتن بەرەولای چەمکە ئەقڵانییەکان لەتیۆرە کیاناسانەکانی فەلسەفەکارانی پێش سوقرات زۆرتر لەهەر شوێنێکی تر سەری‌گرت. کەواتە لێرەدا گێرانەوەی ئوستوورەیی لەئافراندن‌و بەدیهاتنی جیهان جێگەی خۆی ئەدا بەروونکردنەوەی ئەقڵانیی هاماوو گشتیتی یان کیاناسی. ئەگەر دەسەڵاتداریتیی سووژەو دابەزاندنی هەموو شتێ بۆ سووژە بەراستی بابەت‌و ناوەرۆکی راستەقینەی ئوستوورەو فەلسەفەیە، کەواتە پرسیارە سەرەتاییەکانی فەلسەفەو

گۆرانكارییەكانی ئەبێ لەریگەی بەربلاوتركردنەوەی ئەم بابەتەوە بتوانرێ باشتر راڤەو شەرح بكرێ.

پەرەپیدانی ئەو بابەتەی سەرەوە بەناچر بەرەورووی ئاراستەكردنی دوو كیشەمان دەكاتەوە: دۆزینەوەی بنج و بناوان و بناخەیان یان بناخەگەلیكی تاهەتایی و هەرمانی بۆ هەموو بوونەوەرەكان و، گواستنەوەی زۆرینەیی و فراوانیی چشتە تایبەت و بەرهەستەكان بۆ یەكیتییەكی بەربلاو و گشتگیر. مەسەلەی هەرە گرنگ بۆ زۆربەی فەلسەفەكارانی پیش سوقرات دۆزینەوەو دەست نیشانكردنی بناخە یان بنەواشە سەرەتاییەكان بوو و، هەموویان تارادەیەك هەولیاندەدا تایبەتمەندییەكی مادی ببەخشنە ئەم بناخەو بنەواشەگەلە. لەروانگەی تالیس-ەوە، هەمووشتێ لەئاو چیكرابوو؛ ئاناكسیمینس (هەوا)ی بەسەرەتاو بنچینەی شتەكان دادەنا؛ ئەمپیدۆكلیس بروای بەتوخمە چوارییەكان (ئاو، خاك، هەوا، ئاگر) هەبوو و پاشان دوو بنەواشەی ئەوین و رق (یان گرتن و دانەوە)یشی خستە سەر پیرستەكەی. قوتابخانەی فیساغوورس، كە بەراستی تیكەلاویك لەفەلسەفەو ئوستوورە بوو، ژمارەكانی بەسەرەتای دیاردەكانی جیهان لەقەلەم دەدا (هەلبەت ئەم تیۆرە (ئوستوورەیی)یە فرەتر لەتیۆرە كۆنەكانی تر لەتەك روانگەگەلی فیزیكی ماتماتیكی مۆدیرندا ئەخوینێ). بەلام ئاووئاگرو ژمارە-هەروەهاش (مادە)- سەرلەبەر چەمكگەلیكی گشتی و زەینین. هەر لەسەرەتاوە دیاربوو كە

هەر زەین یان سووڕە ئەتوانێ بناخەی هەمووشتێ پیك بینێ. هیندەی نەبرد كە ئانكسا گووراس ئەوەی دەربری كە (ئەقل) (nous) سەرچاوگەی هەموو بوونەوەرەكانە. سوقرات ئەوی بەهۆی ئاراستەكردنی ئەم بۆچوونەوە ستایشت كرد-بەلاّم ئەوەش لەبیر نەچۆوە كە تیگەیینە مادیو ئەمجیهانییەكەی لە(ئەقڵ) بخاتە بەر رەخنەو رەخنەكاری سوقرات خوازیاری ئەقلیكی ئەوپەری مرۆیی بوو و، بەم بۆنەشەوە لەگەڵ ئەو روانگەیەی سۆفیستەكان، كە مرۆڤ هۆو بنیاتی هەموو شتیكە، بەردەوام دژایەتیی خۆی دەردەبری.

مەسەلەی سەرەكی بۆ فەلسەفەكارانی ئیلتایی خالی دووەم بوو كە بریتبوو لەگواستنەوەی زۆرینەیی و فراوانی بۆ یەكیتی. دوائاكامو بەرهەمی ئەم نەریتە فیكرییە تیۆرەكەی پارمینیدس بوو لەمەر یەكیتیو یەكپارچەیی (بوون) وەكو هاماو و گشتیتییەكی بەربلاّو و ئەمئەوو، هەروەها رەتكردنەوەی هەر چەشنە زۆرینەییو گۆرانكاریو هاتوچۆیەك. سەرجەم (بوون) هەمان (یەكە) یان (یەگانە) (The one)یە.

بووناسیی پارمینیدس پیشاندەری دوائارەزوو و كەلكەلەو نموونەی سەرەكیی سەرجەم میتافیزیكە، هەر لەسەرەتاوە تا بەئەمرۆ. (بوونی یەگانە)ی پارمینیدس-یش خاوەن تایبەتمەندییەكی ماددی بوو، بەلاّم تەنانەت بەلگاندنەكەشی راستەوخۆ لەسەر توانستەكانی زەینی بیریار (سووڕە)و یەكیتی بوونو هزر دامەزراوە: (ئەوەی بتوانرێ

بیری لێبکریتەوەو ئەوەی بتوانی بوونی هەبێ هەر یەکیکن).
سەبارەت بەو شتەش کەنییە یان پێی دەوترێ (نەبوون) ناتوانرێ شتێ بوترێو یان تەنانەت هەر بیریشی لیبکریتەوە. بیرکردنەوە دەربارەی (نەبوون) واتە هەمان بیرنەکردنەوە. ئەو شتەی هەیە بیری لێئەکریتەوەو، کەواتە هەمان شت لەهەر چەشنە (نەبوون)یك بەتالە. زۆرینەیی و گۆرانکاریی و هاتوچۆ بەراستیی و لەبنەرەتدا پیکەوە دەربری (نەبوون)ن و هەربەم بۆنەشەوە (ناواقیعی)ن[٣١]. بوون هەر یەکیکە. دوانیشانەی فەلسەفەی پارمینیدس-یش هەمان بنەواشەی (دەرهەستکاری)و (تەجرید)ە: تیپەر ین لەهەر شتێ کە نییە بەواتای گشتیی نەبوون.

تەنانەت ئاقاری (عەدەمو نەبوون)و (مەرگ)یش پیویستە لەم بنەواشەیەوە پەیرەوی بکەن. شیکاریی ئەندیشەی پارمینیدس ئەوە پیشاندەدا کە هەر چەشنە بیرکردنەوەیەکی میتافیزیکی، تەنانەت ئەو جۆرەش کە بەماتریالیزم ناسراوە، بەهۆی تایبەتمەندیی مۆنیستی و دەرهەستئامیزو سەرچاوگەگەرییەوە، لەبنەرەتداو بەراستی شیوەیەك لەئیدیالیزمو بەباشتردانانی سووژەیە.

ئەم بیروبۆچوونانە سەرومر پیکەوەو بەشیوەیەکی راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ تا رادەیەکە-لەبیچم گیریی و بالاکردنی تیۆری نموونەکانی ئەفلاتووندا دەوریان گیراوە- تیۆریك کە سەرجەم شیوە پۆلینبەندییەکانی بەجۆرێ تیکەلاوی بابەتە ئوستوورەییەکان بوو (لەئوستووری

فیساغوورسی ژمارەو تەمسیلی ئەشکەوت-ەوە بگرە تا ئوستوورە کیانناسانەکەی تیمائووس). خودی ئەفلاتوون هەندێ دژایەتی و کیشەی شاراوەی ئەم تیۆرەی لەوتوویژەکانی دوایی‌دا (بەتایبەت ئەوەی پارمینیدس و سۆفیست) دەستنیشاکردووە. کیشەی هەرە گرنگ لیرەشدا ریوراست وە ئەو دوو پرسیارەی کە پیشتر ئاماژەیان پیکرا: کیشەی ژمارەکان و پیوەندیی ئیدەکان بەیەکترەوە وەك بناخەیان بنەواشە گەلی سەرەتایی و، کیشەی فراوانیی چشتە ئەزموونی و واقیعییەکان لەگەڵ یەکیتی و گشتیتیی ئیدەکاندا. بۆ ماوەیەکی زۆر وادەزانرا کە ئەرەستوو بەهۆی ئاراستەکردنی تیۆرە میتافیزیکییەکەیەوە سەبارەت بەجەوهەر هەموو ئەو کیشانەی چارەسەرکردووە، بەڵام دەوام و مانەوەی هیزو شەرعییەتی جەوهەری ئەرەستوویی زۆرتر بەهۆی پیوەندیی لەناکاوی ئەم تیۆرە بەتیۆلۆژیی مەسیحی و ئیسلامییەوە بوو. کاتێ لەسەرەتای سەردەمی نویدا فەلسەفە سەربەخۆیی و سەربەستیی خۆی لەکەلیسەو تیۆلۆژی وەدەست هینایەوە، خیرا دەرکەوت کە گەران بەشوین دۆزینەوەی بناخەیەکی یەکگرتوو، ئەگەر بەشیوەیەکی وردو روون و ئەقڵانی وەدووی کەوین، هیچ ئەنجامیکی بەدواوە نییە جگە لەزەین یان بیرکردنەوەی قوول-واتە، هەمان (بیرئەکەمەوە) کەی دیکارت. نیچە، لەتەشقی فەلسەفەی مۆدیرندا، هەر ئەم خالەی بەروانینیکی سەلبی و رەخنەگرانەوەو بەم شیوەیە دەربریوە: (چەمکی

جەوهەر ئاکامی چەمکی سووژەیە، نەك بەپیچەوانە!) نیچە بەدەربرینی وەها حوکمیك بنیاتی میژوویی ئەو دوو چەمکەشی روونکردەوە، واتە پیوەندیی نیوان دەسەلات بەسەر سروشتدا لەلایەکەوەو پاراستنی خود لەلایەکیترەوە. ئەگەر بریار وایە سروشت بۆ بابەتیتییەکی خاوین و هەروەها ماددەی بیگیانی پیویست لەتویژینەوە زانستی و تەکنۆلۆژیکەکاندا بگۆردرێ، (خود)ی مرۆڤیش ئەبێ بۆ زەینییەتیکی خاوین بگۆردرێ کە ناسینەوەو حەسیبکردن تەنیا تایبەتمەندیی دیاریەتی. (بیرئەکەمەوە) کەی دیکارت بەرهەمو سەرچاوگەی بەرامبەریتیی سووژەو ئوبژەیە. بەبروای نیچەش، ئەم بەرامبەریتییە رەگو ریشەی لەترس لەسروشتی نەناسراوو خواستی دەسەلات بەسەر سروشتدا داکوتاوە. مرۆڤ لەئاقاری ناوەوەو لەرەوتی بیچم گیریی خودداو لەریگەی دەسەلاتی ئەقل بەسەر غەریزەوەیە کە خۆی بەسەر ئەم ترسەدا زاڵ دەکا. سووژە یان (خود) ئەبێ شتێ بێ سەربەستو سەربەخۆ کە لەوپەری شوینو کات، لەناوچوونو تەوانەوەو دابەشبوونو گۆرانکاریدا بێ: واتە، هەمان جەوهەری ئەرەستوویی. هەر تەنیا دوای جەوهەری بوونی خودەکە چەمکی جەوهەر بۆ سروشتی دەرەکیش بەکاردەبرێ. بەم شیوەیە، بەئاریکاریو لەریگەی وتەزای جەوهەرەوەیە کە هەموو ئوبژەکان پەیرەوی لەسووژەوە دەکەن. دەوری سەرەکی ئەم وتەزایەش لە(روونکردنەوەی ئەقلانی)ی جیهاندا بەتەواوی ناسراوە.

بەڵام، سووژەو ئوبژە هەردووکیان چەمکگەلیکی لیکدژو تەنانەت کیشە سازکەریشن. لەسەردەمی ئەرەستووەوە تا سەردەی دیکارت و سپینۆزا فەلسەفەکاران بەردەوام لەگەڵ کیشەی فراوانیی جەوهەرەکان و ئەو دژایەتییانەی دوای بەکارهینانی وتەزای جەوهەر بەشیوەی (کۆ) قوت دەبنەوە رووبەروو بوونەتەوە. تەنانەت دیکارت ئاماژەی بەو خاڵە کردووە کە بەکارهینانی وتەزای (جەوهەر) سەبارەت بەخواوەندو ئافریندراوەکانی بەشیوەیەکی یەکسان زۆر بێ ماناو لیلەو لەهەمان کاتیشدا بەیەکیك لەهەڵە زەقەکانی قوتابخانە گەلی فەلسەفەی سکولاستیکی دادەنرێ[٢٣]. یەکیتی و نەگۆریی جەوهەرو پیوەندییەکەی بەشتومەکە بگۆرەکانەوەو هەروەها تایبەتمەندیی رۆحانیی جەوهەرو پیوەندییەکەی بەجەستەوە- بەتایبەت کیشەی هەستانەوەی جەستەیی (لەقیامەتدا)- لەکیشە چارەسەرنەکراوەکانی فەلسەفەی میتافیزیکی و تیۆلۆژیی ئەرەستووییە. هەر بەهەمان شیوەی سەرەوە، فراوانیی ژمارەی سووژە گەلی ترانسیندینتاڵ (بەوینەی بناخەی هەموو شتیك) و ئەگەری سەرهەڵدانەوەی جیاوازی لەنیوانیانداو هەروەها پیوەندیی نیوان سووژەی ترانسیندینتاڵ و سووژەی ئەزموونی لەهەر تاکیکی تایبەتدا- یان بەوتەی میشل فۆکۆ، (دوو بەرابەر بوونەوەی سووژە)- چ لەئەندیشەی دیکارت و چ لەدوای ئەوداو بەگشتی لەفەلسەفەی مودیرندا هەروا چارەسە نەکراو ماوەتەوە.

سەرجەم ئەم بابەت و کیشە گەلە لەبنەرەتدا دووبارەبوونەوەی هەمان بابەتە ئوستوورەیی و سەرەتاییەکانن. لەگەڵ سەرهەلدانی باوەر بەمانا، وەك هیز یان گیانی شاراوە لەهەموو شتیکدا، هەر چشتیکی تایبەت، وەك تاقەدار یان بەردیك، گۆردراوبوو بەدیاردەیەکی نویّ کە شتیك زۆرتر لەداروبەرد بوو. ئەم (شتە زۆرە) کە خرایە سەر بوونی بەرهەستی دار یاخود بەرد، بەراستی بەهۆی نەبوونی هەرچەشنە تایبەتمەندییەکی بەرهەست و ئاشکراوە، لەئاکامدا تایبەتمەندییەکی گشتی و دەرهەستی گرتە خۆی. ئەم توخمە گشتییەیان مانا لەئوستوورەدا بوو بەقەدەری ئوستوورەیی یان بنەواشەی یەکسانیبەخش یان سیستەمی کەیهانی. (ئەم بنەواشە یاخود سیستەمە لەهیندا ریتا، لەیۆناندا دایکەو لەچیندا بەمەلکوت ناوی لیّبراوە.) لەروانگەی ئوستوورەییەوە، تاکە مرۆییەکان ئەبیّ لەسیستەمی کۆمەلایەتی و زنجیرە قۆناخەکانی (ئەو سیستەمە) پەیرەوی بکەن و ئەگەر پیویستیش بیّ گیانی خۆیان لەو پیناوەدا بەخت بکەن؛ ئەم سیستەم و چوارچیوە کۆمەلایەتییەش لەژیر چاودیریی هیزە ئوستوورەییەکان و زنجیرە قۆناخەکانی خواکاندایە، خواکانیش لەئاکامدا لەسیستەمی کەیهانی و قەدەری ئوستوورەیی پەیرەوی دەکەن. لەگەڵ سەرهەلدانی فەلسەفەدا، سیستەمی کەیهانی جیگەی خۆی ئەبەخشیتە گەرانی ئەقلانی بۆ دۆزینەوەی بنج و بناخە (ی هەموو شتیك). کیشەی زۆرینەیی خواکان بۆ

پرسیاری زۆرینەیی بناخەکان ئەگۆردرێو کیشەی پیوەندیی نەزمی مرۆیی بەسیستەمی کیانیو کەیهانییەوە ئەگۆردرێو ئەبیتە کیشەی پیوەندیی جیهانی دەرکەوتە هەستییەکان بەجیهانی راستەقینەی زاتو جەوهەرەوە.

تا ئەو شوینەی پیوەندیی بەئاکامەکانی بنەواشەی دەسەلاتەوە هەبێ، فەلسەفە لەهەموو بوارەکاندا پێ لەسەر زنجیرە قۆناخەکانی دەسەلاتو قوربانیکردنی شتە تایبەتەکان لەبەردەم شتە دەرهەستەکاندا دادەگرێ. بۆ نموونە، لەبەستینی ژیانی کۆمەلایەتیدا فەلسەفە هەولدەدا دەسەلاتی کۆ بەسەر تاکدا لەباری ئەقلانییەوەو لەریگەی یەکگرتنی هیزو زانیاری پیکەوەو لەروالەتی (پاشا-فەیلەسووفا)ەکەی ئەفلاتووندا شەرعیو یاسامەند بکاتەوە. هەر لەو کاتەدا ، تراژیدیای یۆنانی لەبری ئەوەی ئەم بابەتە ئوستوورەییە ئەقلانی بکاتەوە-واتە کیشەی نیوان تاکو کۆ، یان بەرامبەریتیی چاکەو توانستی تاکی (ئارتە، Arte) لەلایەکەوەو راستیی کۆیی یان کەیهانی (دایکە) لەلایەکی ترەوە-هەر تەنیا هەولی ئەدا بابەتەکە بنوینێ (مایمیسیس)و لەسۆنگەی بەرجەستەکردنی قوربانیبوونی پالەوانەکەوە ئازادیو سەربەستیی تاکە مرۆییەکان لەشەر لەتەک هیزە کویرەکانی قەدەری ئوستوورەیی یان (چەرخی بلند)دا دووپات بکاتەوە.

هەلبەت فەلسەفەی میتافیزیکیش لەپیگەی نیشانەو دەرکەوتەیەك لەرۆحی رۆشنگەری یان ئوستوورە سرینەوە

هەر لەسەرەتاوە تایبەتمەندییەکی دیالکتیکی هەبوو؛ واتە، هەوڵ بۆ رزگاریی مرۆڤ کە بەکۆیلایەتی مرۆڤ کۆتایی پێ دێ. دۆزینەوەو دەستنیشانکردنی چەند نموونەیەکی جۆراوجۆری لایەنگریی فەلسەفە لەبنەواشەی دەسەڵات (بەسەر سروشت، زەمەن، مرۆڤ و..هتددا) کاریك زۆر دژوار نییە. بەڵام، هەموویان، تارادەیەك، بنجیان لەئیدەو یاخود بنەواشەی سەرەکیی میتافیزیکدایە، کە هەمان بنەواشەی ئەمئەوەکی (identity)یە. ئەم بنەواشەیە پێش مەرجی سەرهەلدانی سووژەو ئوبژەو بەرامبەریتی نیوان ئەو دوانەیە. سەرهەلدان و دەوامی سووژە یان خودی نەگۆرو هەلگری یەکپارچەیی و یەکیتیی و نەگۆریی جەوهەری، پیویستیی بەئەمئەوەکیی خود لەگەڵ خۆیداو نەبوونی هەر چەشنە دژایەتی و پچران و بۆشاییەك لەوێ هەیە. ترس لەدابەشبوون و ونکردنی خود لەسروشتداو گەرانەوە بۆ پیگەی حەیوانی یەکێ لەهۆکانی توندوتیژی و تەنیایی و زویریی خود پیك دینێ. هەر بەم شیوەیە، ئەمئەوەکیی چشتەکانە بەوینەی ئوبژەگەلیك کە لەلایەن سووژەوە ئەناسیندرینەوەو کۆنترۆڵ دەکرین. بێ پەل هاویشتن بۆ لۆژیکی ئەمئەوەکی، تویژینەوەی زانستی و کۆنترۆلی هونەریش سەرناگرێ لەنەریتی فەلسەفەی میتافیزیکیدا نەك هەر جەوهەرو هۆداریتی بەلکو خودی چەمکی (راستی)یش لەسەر بنەواشەی ئەمئەوەکی دامەزراوە. تەنانەت لەتەشقی ئەم نەریتەشدا، (راستی) وەکو ئەمئەوەکیی زەین– عەین

(یان، ناسکار– بابەت) لەرواڵەتی هاماویکی باشتردا بەناوی ڕۆح (Geist) پێناسە ئەکرێ؛ بەڵام، ڕۆح یان زەین–عەینی ئەمئەوی هیگل لەبنەڕەتدا شتێ نییە جگە لەزەین. لەئاکامدا، (ڕاستی) هەمان زەینە کە خۆی ئەناسێ و بەهۆی ئەم ناسینەوەیە کە لەگەڵ خۆیدا ئەبێتە یەکێ: ئەم ئوبژەیە هەمان سووژەیە (واتە ((ئەمهەمانی))یان ((ئەمئەوەکی))).

پێویست ناکات گۆڕانکاریی سەرجەم ئەم ڕەهەندانە لەقۆناخی چوارەمدا بپشکنین کە سەردەمی زانست و تەکنۆلۆژیایە. ئاوردانەوەیەکی خێرای نموونەی سەرەکی و یەکەمین بیرکردنەوەی زانستی، واتە فەلسەفەی دیکارت، خۆی لەخۆیدا دەربرو پێشاندەری هەموو شتێکە. ئەندیشەی دیکارت باشترین ویناکردنی جەغزی بیهوودە یان ئەلقەی ئوستوورەییە: دابەزاندن و کورت و کۆکردنەوەی هەموو ئوبژەکان بۆ هاماویکی دەرهەست و زەینی بەمەبەستی دەسەڵاتی سووژە بەسەر هەموو شتێکدا کە بۆ خۆی سەرچاوگەی بەرامبەریتیی میتافیزیکی زەین و عەین و نامۆیی ڕاستەقینەیانە، کە ئەمەش لەئەنجامدا دەبێتە هۆی گەشەکردن و دەوامی ئاوات و خواستی دەسەڵات. هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی بناخەیەکی ڕەها بۆ (بوون) و (ڕاستی) مەبەستی سەرەکیی فەلسەفەی دیکارت بوو. وەدیهاتنی ئەم مەبەستەش خاوەن سروشت و چییەتییەکی سەرانسەر میتۆدۆلۆژیك بوو و شێوەکە لاساییکردنەوەیەکی تەواوی ماتماتیك بوو. دیکارت، لەچاو سیستەمە فەلسەفییە

پیشـــووەکانی‌تر، بەئاشـــکراترین‌و راشـــکاوانەترین شـــیوە فەلســـەفەو بیریـــاریی فەلســـەفیی خـــۆی لەگـــەڵ ماتمـــاتیک‌و میتـــۆدی ســـەلماندن‌و دووپاتکردنـــەوەی ماتمـــاتیکیدا کـــرد بەیـەکێ‌و، لـەم ریگەیـەوە ئاواتی کۆنـی فیساغوورسـییەکانی هینایەدی. لەهەمان کاتیشدا، باشتر لەهەر کەسیکی دیکە ئەو خالەی خستەروو کە ئەنجامی ئەم گەرانە ناتوانێ شتیکی‌تر جگـــە لـــەخودی زەیـــن یـــان ســـووژەبێ. هـــەروەهاش دووپاتی‌کردەوە کـە (خودگـەریتی) (Solipsism)، بـاوەر بـەوەی کە جگە لـە(خود) یان (من) چیدی لـەگۆریدا نییـە) ئاکـامی لۆژیکیی هەرچەشـنە ئەقلخوازییـەکی میتافیزیکییـە. بـەپیی بـیروبۆچوونی دیکـارت‌و کـانت، (بیرئەکەمـەوە) بناخـەی مەعریفـە ناسـانەی هـەر چەشـنە ناسـینەوەیەکی بابەتیانـەو تەنانەت زانستە سروشـتییەکانیش پیکدینـێ. دیکارت-یش وەك گالیلـە لەسـەر ئـەو بروایـەدا بـوو کـە کتیبـی سروشـت بەزمانی ماتماتیك نووسراوەو ئـەکرێ بەیارمـەتیی میتـۆدی زانســـتی‌و لەریگـــەی بـــەکارهینانی ژمـــارەو پیوەندییـــە چەندییەکانەوە هەر دیاردەو نهینییەك‌و تەنانـەت مرۆڤیـش تویکاری‌و ئاشکرابکریتەوە.

هەلبـەت ئـەم خالـەی دوایـی، واتـە (روونکردنـەوەی زانستی)ی مرۆڤ‌و کۆمەلگای مرۆیی، بۆ خۆی پیشاندەری یـــەکێ لـــەگرنگترین دژایەتییـــە ناوەکییـــەکانی گەلالـــەی رۆشنگەرییە کە ئیستا ئەبێ باسی لیوەبکەین. رۆشنگەریی سەدەی هەژدەهەم بەئیدەو بەرنامەی گەورەیی‌و سەروەریی

مرۆڤ و رزگاریی دی لەچوونە ژێر رکیفی هەر چەشنە دەسەڵاتیك جگە لەهزری خودئایین دەستی پیکرد. ئیدەی (مافە سروشتی و ئاساییەکان) و بەها ناشیوەییەکانی ئازادی و یەکسانیی سەرجەم رەگەزی مرۆڤ بناخەی ئەو بەرنامەیەی پیك دەهینا و ئامرازەکەشی روانینی زانستی و بەکارهینانی زانست لەهەموو رەهەندەکانی ژیانی مرۆڤدا بوو. بەڵام لەنیوان ئەو بناخەیەو ئەم ئامرازەدا دژایەتییەك لەئارادا بوو کە سەرنجی زۆربەی هەرەزۆری دامەزرینەرانی (رۆشنگەریی) بۆ لای خۆی رانەکیشابوو (رەنگە تارادەیەك جگە لەرۆسۆ). میژووی رۆشنگەری ئەتوانرێ بەگویرەی پەرەسەندنی ئەم دژایەتییە بنووسریتەوە، واتە ئەکرێ بەپیی سەرهەلدانی ئەو روانین و قوتابخانە گەلە بیتە تۆمارکردن کە هەر کامەیان قوتابخانەکانی پیش خۆیان بەتاوانی میتافیزیکی و نازانستی بوون رەت دەکردەوە. هاوکات لەتەك پەرەسەندنی روانینی زانستی، بەها بنچینەییەکانی رۆشنگەری وەك تاکیتی و ئازادی هوشیاری هەمان چارەنووس بوون کە بەها نەریتییەکانی کۆمەلگای چەرخەکانی ناوەراست تووشی هاتبوون. بەواتایەکی‌تر، ئەم بەهایانەش خرانەسەر کۆی (خورافە ئوستوورەییەکان)، چونکە لەدیدی ئەقلی شیوەیی و ئامرازییەوە ئەمانە هەندێ شتێ سەرانسەر زەینی و دلخوازبوون کە بناخەو بنگەهیکی (عەینی) و بابەتیانەیان نەبوو. هاوکات لەتەك زانستی بوونی ئابووری و رامیاری، ئاواتی دیکارت-یش سەبارەت بەگۆرینی

ئاكار بۆ زانستیکی ریکوپیك تارادەیەك هاتەدی؛ بەڵام ئەم (ماتماتیکە کۆمەڵایەتییە)ش، وەکو زانستە سروشتییە مۆدیرنەکان، هەر توانای ئەوەی هەبوو کە بابەتەکەی خۆی (شیوەیی) بکاتەوەو ئاستی پیوەندییە مرۆییەکان بۆ چەند پیوەندییەکی چەندی داببەزینێ-لیرەشدا دوامەبەست هەمدیسان دەسەڵاتداریتی بەسەر بابەت‌و دەستکاری‌و کۆنترۆڵکردنی ئەم بابەتە بەشیوەیەکی هونەری بوو. بنەمای پیشە، کە پیوەندیی مرۆڤ‌و سروشتی پیکەوە دەست نیشاندەکرد، هاتە نیو ئاقاری کۆمەلگاو کولتوورەوەو، لەئاکامدا، کولتووریش گۆردرابوو بەپیشەی کولتوورسازی.

رۆشنگەری، بەم شیوەیە، هاوکات لەگەڵ پەرەسەندنی خۆی، بناخە بەهاییەکانی خۆی لەناوبرد. هەلبەت، وەدیهاتن‌و سەرگرتنی ئەم رەوتە لەواقیعی مرۆیی‌و کۆمەڵایەتیداو هەروەهاش رەنگدانەوەی ئاشکرای لەزانیاری‌و هۆشیاری‌و خود ئاگایی مرۆڤدا چەند سەدەیەکی خایاند. ئەو دژایەتییەی سەرەوە تەنانەت تا سەردەمی ئیمەش هەر دریژەی هەبوو میژووی گۆرانکاریی پۆزیتیڤیزم لەسەدەی نۆزدەهەمەوە (ئاگوست کۆنت) تا ناوەراستی ئەم سەدەیە (پۆزیتیڤیزمی لۆژیکی) بەراستی نموونەیەکی بەرچاوی هەمان رەوتە کە لەدریژاییەکەیدا هەر بیرمەندیکی نوێ پیی وایە روانینی پیشینیانی خۆی هیشتا تیکەڵاوی میتافیزیك‌و روانگەگەلی نازانستییەو پۆزیتیڤیستی راستەقینە هەر خۆیەتی.

هەر تەنیا لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا بوو کە دژایەتیی ناوەکیی گەڵاڵەی رۆشنگەری بەراشکاوی دەست نیشانکرا؛ واتە ئەو کاتەی کە ڤیبیر پەنجەی خستە سەر ئەو خاڵە گرنگە کە ئەقڵانییەتی شێوەیی و ئامرازیی زاڵ بەسەر کۆمەڵگای بورژواییدا بەهیچ کلوجێک ناتوانێ ئەرکی دادوەریکردن دەربارەی بەهاو سنوورە دیارەکان-وەك ئازادی، بەرابەری و برایەتی-بەجێبێنێ و، بەراستی تەنیا ئەرکیشی نرخاندن و هەڵبژاردنی شێوەو ئامرازە پێویستەکانە بۆ گەیشتن بەمەبەستە دلخوازەکان. دیالکتیکی رۆشنگەری، بەسرووش وەرگرتن لەمارکی دوساد-ەوەو بەشێوەیەکی هەرە ئاشکراو راشکاوانە، ئەو خاڵەی سەرەوەی دووبارەکردۆتەوە: ئەقلی بورژوایی ناتوانێ بەلگەو یاخود هۆیەك بۆ رەتکردنەوەی قەتڵ و مرۆڤکوژی بێنێتەوە. بەهۆی سەرهەڵدانی نیهیلیزم و پووچ و بێمانابوونی هەموو بەها جەوهەرییەکانەوە (نیچە) چیدیکە نامێنێتەوە جگە لەپێوەرگەلیکی بەدیهاتوو لەزانست و تەکنۆلۆژیا و پیشەسازی: کارایی، سوودمەندی و پێشبرکی. کەواتە، بەپێچەوانەی بیروبروای کانت، بۆ مرۆڤی تەنیا و تەریك و تاککەوتوو (چشتئاسا)ی کۆمەڵگای بورژوایی، گەران بەدوای قازانجە کەسانییەکان هەلبەت بەنرخی لەناوچوونی دیتران رەنگە تەنیا بنەواشەی گشتی و ئاشکرای ئەقلی کردەیی پێك بێنێ. لەسەدەی هەژدەهەمدا هەر تەنیا مارکی دوساد بوو کە توانی ئەم رەهەندە تاریکەی ئەقلی بورژوایی و

ئەقلانیبوونی جینایەت و چیژ هەست پێبکات و دەریببڕێ[٢٥].
تاقمیکیتر لەبیرمەندە رەشبینەکان، وەك ماندڤیل رووبەرووی ئـەم واقیعـە بوونـەوە، بـەڵام لەرێگـەی هـەندێ حوکمـەوە هەولیاندا پاساوی بکەنەوە؛ هەندێ لەو حوکمانە بریتیبوون لە: (خراپییە تاکییەکان ریخۆشکەری چاکییە گشتییەکانە.) یـان (گـەران بـەدوای قازانجـە کەسـانییەکاندا بەیارمـەتیی دەستی نەدیتراوی بازار دەبێتە بەدیهێنەری پارەوبەختەوەری گشـتی)، بـەڵام زۆربـەی بیرمـەندان هـاورێ لەگـەڵ (بـیری گشتی)دا ئەوەیان بەباش زانی کە چاوپۆشی لەدووریی زۆری نیـوان ئارمانجـەکان و واقیـع بکـەن و، هـەمان دروشمگـەلی سەردەمی رۆشنگەری لەمەر (ئازادی) بەرابەری و (برایـەتی) دووبارەبکەنـەوە، هەرچـەندە لەوکاتـەدا ئـەم قسـانە زۆرتـر روالـەتی جۆرێ (فریودانـی پیویسـت)ی لـەخۆگرتبوو خـاوەن بناخەیەکی (ئەقلانی) نەبوو.

بەڵام گرنگترین دەسـتکەوتی رۆشـنگەری، یـان بـەجۆرێ پالەوانی سەرەکی و دوائاکامی گیرانەوەکەمان، تەکنۆلۆژیایە نـەك زانسـت. رەخنـەگرە هـەرە ناسـراوەکانی ئاوەزیـاری و ئەقلئامرازیی مودیرنیش ئـەم خالـەیان دووپـات کردۆتـەوە . مارتین هایدیگر لەوتاری (پرسیار لەتەکنۆلۆژیا)[٢٦]، کە رەنگە روونـترین و رەخنەگرانـەترین نووسـراوەی بـێ ـ ئـەوەی خستەبەرباس کـە تـەکنۆلۆژیا هـەم لـەباری مێژوویـی و هـەم لـەباری بوونـی و زاتییـەوە لەزانست لەپێشـترداية. هـەر بـەم بۆنەشەوەیە کە دیالکتیکی رۆشنگەری بەوتەیەك لەفرانسیس

بەیکن–ەوە دەست پێدەکات نەك لەدیکارت و یاخود گالیلەوە، کە بابەتە سەرەکییەکەی ئاماژەکردنە بۆ پێوەندیی زانیاری و هیزیکەوەو سروشتی کاربردیی زانستی مودێرن، ئەو زانستەی کە بریار وایە بەوەلانانی پرسیارە بیکەلك و سوودە میتافیزیکییەکان لەپیناو باشتربوونی ژیانی مرۆڤ و ئازادی و بەختەوەرییدا هەنگاوهەلبگریّ. تەکنۆلۆژیا، بەراستی، باشترین ویناکردنی بنەواشەی دەسەلاتداریتیی سووژەیەو سەرلەبەری ئەو رەهەندو تایبەتمەندیانەی لەگیرانەوەکەماندا خستمانە پالّ ئەم بنەواشەیەوە، لەتەکنۆلۆژیادا بەباشترین شیوە هاتوونەتە دی و رەنگیان داوەتەوە.

تەکنۆلۆژیا، بیگومان، بەتەشقی رەوتی دەرهەستبوونەوەی پیوەندیی مرۆڤەکان بەسروشت ویەکترەوە دادەنریّ. لەتەکنۆلۆژیای مودیرندا هەموو شتیّ بەگویرەی زمانی کۆمپیوتەری، واتە ماتماتیك و لۆژیکی شیوەیی، دیتە هەلسەنگاندن و شیکردنەوە و کۆنترۆلّ کردن. بۆ کۆمپیوتەریش هەموو شتیّ لەپیگەی (دادە) ئاگادارییەکاندایەو، کەواتە، لەویّ هەموو شتەکان لەهەر چەشنە چۆنایەتییەکی بەرهەست بۆش و بەتالن و بەشیوەیەکی بەراورد نەکراوو تایبەت بەخۆیان دەمیننەوە. گۆرینەوەی (دادە)کان سەرچاوگەلی دەرهەستبوونی جیهان لەسیستەمی تەکنۆلۆژیکی مودیرندایە.

تەکنۆلۆژیا لەبنەرەتدا گشتی و گشتگیرەو خاوەن تایبەتمەندییەکی خۆویست و پاوانخوازە (واتە، تۆتالیتەر).

هایدیگر بەبەکارهێنانی زاراوەی (گیشتل) (Gestell) بەمانی (چوارچێوەبەندی) ئەم لایەنەی تەکنۆلۆژیای مۆدێرنی بەرجەستەکردۆتەوە، وەکو سروشت و چیەتیی تەکنۆلۆژیای نوێ داینـاوە. بەباوەڕی ئیلڤیل، خۆویستیی تەکنۆلۆژیای سەردەمی ئیمە گەیشتۆتە رادەیەك کە ئەورۆکە هەرکارێ، هەر تەنیا لەباری تەکنۆلۆژیکەوە ئەگەری ئەنجامدانی لەگۆڕیدابێ، خێراو بەبێ سەرنجدانی هەرچەشنە راڤەیەکی ناهونەری ئەنجام ئەدرێ.

(بۆ وینە، ناردنی مرۆڤ بۆ مانگ بەنموونەی بەرچاوی ئەم بابەتە دادەنرێ) لەدیالکتیکی رۆشنگەری-یدا تەکنۆلۆژیا بەتەشقی نامۆیی و ترسی ئاوەزئامرازی لە(ناخود) یان (ئەویدی) ناوی لێبراوە؛ ئاکامی ئەم ترسەش خواستی گشتگیری و کیشانی هەموو شتیك بۆ ناوەوەی سیستەمی تەکنۆلۆژیکە.

پیوەندیی تەکنۆلۆژیا بەبنەواشەی دەسەلات و دەسەلاتداریتی مرۆڤ بەسەر سروشتەوە باسیکی ئاشکراو کۆنە کە رەخنەلیگرتنی تا ناوەراستی سەدەی ئیستا بەنموونەیەکی‌تر لە(رەخنەگرتنی تاقمێ (نیمچە) رۆشنبیری نارازی) دادەنرا، کەچی ئیمرۆژە گەشەکردنی قەیرانی ژینگە رەهەندی تاریکی ئەم پیوەندییەی بۆ هەمووان روون کردۆتەوە. لەروانگەی هایدیگرەوە تەکنۆلۆژیا دەربڕو پیشاندەری دەست تیوەردانی توندوتیژی مرۆڤ لەسروشت و گۆڕینی سروشت بۆ جۆرێ (کان یان تۆشەی نەگۆڕ)ە.

ئادۆرنۆو هۆركهایمر تەكنۆلۆژیای مودیرن بەباشترین شیوەی وینــاكردنی هــەمان دەســەلاتو توندوتیژیــی ئوســتوورەیی دەزانــن كــە ئەورۆكــە بەشــیوەیەكی ریكوپیــكو تــەكووزو گشتگیری هەم لەسەر سروشتو هەم لەسەر خودی مرۆڤەكان دادەسەپیندریّ. بگۆڕیو هیزی پیشەییو هونەریی ئەلمانی هیتلــەری لەگــەڵ توندوتیژیــی رەگەزپەرســتیو ئوســتوورەی خــاكو خوینــی نــازیزمدا پیوەندییــەكی قــووڵو دوولایەنــەی هەبوو.

ئامادەبوونیســــەرجەم ئــــەو توخــــمو رەهەندانــــە لەتــەكنۆلۆژیادا، بەشیوەیەكی گەشــەدارانەو یــاخود بەگەشــەو نەشـــــەیەكی زۆرتــــرەوە، پیشـــــاندەری تایبەتمەندییــــە ئوســـتوورەیییەكەیەتی– تەنانـــەت هـــایدیگریش لەریگـــەی شیكاریی تەكنۆلۆژیاوە كە وەكو جۆریّ (قەدەر) یان (مۆڵـەتی میژوویـــی) دایدەنـــیّ، بەشـــیوەیەكی پالـــەكی پیوەندیـــی تــەكنۆلۆژیاو ئوستووره دووپــات دەكاتــەوە كەواتــە، لــەخۆڕا نییــە كە تــەكنۆلۆژیا بۆ هــەموو ئــەو كەســانەی لیــی بیبەشــن بــەجۆریّ پیــلان یــان ئــامرازی ســیحراوی دادەنــریّ، كــەچی لەروانگـــەی چیكـــەرانو، یـــان بەوشـــیوەیەی ئیمـــرۆژە بــەكاردەبریّ، لەروانگـــەی خاوەنەكانییـــەوە وەكـــو (رۆحـــی سەردەم) یان قەدەری ئوستوورەیی سەیر ئەكریّ.

*　　　*　　　*

ئــەو گیرانەوەیــەی لــیرەدا ســەبارەت بــەهیندیّ لەبابەتــە بەرچاوەكانی دیالكتیكی رۆشــنگەری ئاراســتەكرا، بیگومــان

خۆی لەخۆیدا کێشە سازکەرە. هەر تەنیا لەساکارترین ئاستی پێوەندیدار بەخوێندنەوەو وەسفەوە ئەم پرسیارە دێنە پێشێ کە بۆچی نووسەرانی ئەم کتێبە گێرانەوەکەیان لەمێژووی سووژە بەم شێوەیە، واتە لەرواڵەتی ئەو چوار قۆناخەی سەرەوەدا، ئاراستە نەکردووە. لەئاستی رەخنەی ناوەرۆکی و تیۆریکیشدا پرسیاری سەرەکی بریتییە لەدژایەتییە ناوەکییەکانی خودی ئەم گێرانەوەیە؛ بۆ نموونە، چلۆن ئەکرێ هاوکات لەگەڵ هێرش بۆ گشتیگەریتی و بابەتیتیگەریتی دەرهەست راڤەیەکی بابەتیانە لەسروشتی سەرجەم مێژووی شارستانیتی مرۆیی بکرێ و، هەر لەهەمان کاتدا لەلایەکەوە لە(لۆژیکی ئەمئەوەکی) رەخنەبگیردرێ و، لەلایەکی ترەوە هەمووشتێ لەبابەتی دەسەڵات بەسەر سروشتدا کۆو بەرجەستە بکرێتەوە؟ هەڵبەت ئەکرێ ئەم پرسیارە بەشێوەگەلی جۆراوجۆر پۆلینبەندی بکرێ. بۆنموونە، ئەکرێ، هەروەك یورگن هابرماس، لەروانگەیەکی میتۆدۆلۆژیکەوە سەیربکرێ و پرسیاری سەرچاوگەی مەعریفە ناسانەو بەهایی و نۆرمیی تیۆری رەخنەگرانە ئاراستە بکرێ: ئەو تیۆرەی کە فەلسەفەو زانستە کۆمەڵایەتییە مۆدێرنەکان بەگوتارگەلیکی ئوستوورەیی دادەنێ لەکوێیوەو لەسەر چ بناخەیەك ئەتوانێ گۆرانکاریی کۆمەڵگاو ئاوەزئامرازی بخاتە بەر رەخنەکاری؟ هەر بەم شێوەیە، کێشەی شاراوەی چۆنایەتیی پێوەندیی تیۆر رەخنەگرانەی هۆرکهایمرو ئادۆرنۆ بەمارکسیزمەوە– کە

هۆکاری سەرەکیی هیرش برانە سەریان لەراستو چەپــەوە بوو–رواڵەتیکی تری ئاماژەکردن بۆ هەمان پرسیارە.

لیرەدا هەر تــەنیا ئــەتوانین پەنجــە بخەینــە ســەر هــەندێ لایـــەنی ئـــەم پرســـیارانەو تارادەیـــەکیش خوینـــەر لەوەڵامدانــەوەیاندا رینوینــی بکــەین. یەکــەمینو گرنگــترین رینوینــی لەلایــەن ئــادۆرنۆو هۆرکــهایمرەوە ئاراســتە کــراوە. (شــاراوەیی حەشــاردراو لــەم رینوینــیو شــوین پییــە هیرمنۆتیکییانــەدا ئــەنجامی لۆژیکیــی جیانــەبوونی میتــۆدو ناوەرۆکە. بەهۆی شاراوەییو تاریکایی حەشاردراو لەخودی گەڵاڵــەی رۆشــنگەریدا هــەر تــەنیا لــەو ئاقــاری شــوین پــێو کــەلاوەکان) دایــە کــە هیشــتا ئــەتوانین بــەدوای نیشــانەو تەمسیلگەلی راستیو رزگاریو ئومیددا بگەریین). ژیرنــاوی دیالکتیکی رۆشنگەری، پارچە فەلسەفییەکان–ە، کە لابردنی لەوەرگیرانە ئینگلیزییەکەی ئەم کتیبەدا بۆ خۆی بۆتە هۆی ســەرچاوگەی چــەوت تیگەیشــتن. تیگەیشــتن لــەمانای راستەقینەی ئەم دوو وشەیە، واتە هەمان هەڵینانی مەتەڵو درەوشاوەیی راستی (هەلبەت چەمکی بینیامینیی (راستی) فرەتر لەبۆچوونەکــەی ڤیتگنشــتاین ســەبارەت بەچییــەتیی بیریاریی فەلسەفی وەکو نەمانو چارەسەرکردنی مەتەڵەکان ئەچێ، تا ئەوەی کە ئەو چییەتییە لەئاراستەکردنی چەمكو بەڵگاندنیکی نویترو بەرفراوانتردا کورت بکەینەوە).

پیداگری ئادۆرنۆو هۆرکهایمر لەسەر وشەی (پارچەکان) بەشیك لەنارەزایەتیی بنچینەیی ئەوان لەگەڵ سیستەمسازیو

بیریـاریی سیســتەماتیك پیـك دینــێ؛ هــەمان سیســتەم کـە جیابوونـەوە لەبابـەتی تایبـەت و بەرهەسـت و وەدەسـتهێنانی گشـتیتی و پیداویسـتی بەنیشـانەی راسـتەقینەی هەرچەشـنە زانیارییــەکی ئــەقلانی دادەنــێ. تیگەیشــتن لــەمانای ئــەم پیداگرییە- کە زۆرتـر لـەبیروراکانی بینیـامین-ەوە وەرگیراوە تـا ئەوانــەی نیچــە-پیویســتی بەروونکردنــەوە و هــەلینانی مەتەلی (گشتیتی) و (ئەمئەوەکی) هەیە.

لەدیتنی یەکەمدا، وا دیتە بەرچاو کە بۆچوونی ئادۆرنۆ لەمەر چەمکی (گشتیتی) لیکدژو دوولایەنەیە، بەم مانایـە کـە ئادۆرنۆ دژ بەنەریتی ئەزموونگەری و پۆزیتیڤیزم گرنگایەتیی ئەم چەمکە دووپات دەکاتەوە؛ ئەمەش لەکاتیکدایە کە خودی ئــادۆرنۆ لەرەخنــەکاریی فەلســەفەی هیگــل و هوســیرل و هــــایدیگردا، (گشــــتیتی) وەکــــو یــــەکیك لەرەهــــەندە میتافیزیکییــــەکانی ســــووژە دوورو رەتدەکاتــــەوە، بــــەلام، بەباوەری ئادۆرنۆ، چەمکی پۆزیتیڤیستی (واقیع) (یان فاکت) بۆ خۆی چەمکیکی دەرهەست و، کەواتە، گشتییە. رەخنەی دەرهەست و تاکرەهـەندیی پۆزیتیڤـیزم لەگشـتیتی، کـە هـەر تـەنیا لایـەنی بەرامبـەری بەرجەسـتە دەکاتـەوە، مەبەسـتیکی نییـە جگـە لەدابـەزاندنی تیکرایـی هـەموو بابـەتیك بـۆ یـەك بناخــەی رەهــا- (واقیــع) (دادە هەســتییەکان) (بابەتــە سەرەتاییەکان) (elementary objects)-لیرەشەوەیە کە دەچیتە نیو ئاقاری بیریاریی ئیدیالیستی بنیاتنراو لەسەر بنەواشەی (ئەمئــەوەکی). بــەبروای ئــادۆرنۆ، نموونــەی راســتەقینەی

گشتیتی هەمان کۆمەلگا (یان رەوتی بەکۆمەلگابوون)ە، کە لەپێگەی (سروشتی دووەمین)دا لەسەرتاکەکانی ئەو کۆمەلگایە دادەسەپیندرێ. گشت یان گشتیتییەك کە لەرێگەی کۆکردنەوەی هەموو پاژەکانەوە بابەتیتی و شوناسیکی سەربەخۆی بوونیانەی وەدەست هیناوە، بەتایبەت ئەگەر لەروالەتی سووژە یان بکەریکی کۆیی وەك نەتەوەو چین یاخود (رۆحی رەها)و (رەگەزی مرۆڤ) دابێ، بەراستی و لەبنەرەتدا چەوت و ناراستە. هەر تەنیا کیشی نیوان (هاماویان گشتیتیی)و (پاژ)یان (ئەمئەوەکی)و (نەبوونی ئەمئەوەکی)یە کە ئەتوانێ بەستینیك بۆ بەدیهاتنی راستیی میژوویی ساز بکات. رەخنەی ئادۆرنۆ لەکۆمەلناسیی پۆزیتیڤیستی و پیداگریی وی لەسەر دانانی دیاردەکان لەناخی هاماویکی کۆمەلایەتیدا پیویستە هەر لەم روانگەیەوە راڤەبکرێ و لیی بکۆلدریتەوە؛ واتە، بەمەبەستی دۆزینەوەی نیوەنجەکان و پۆلینکردنی دیاردەکان (و توخمە سەرەکییەکانی) لەگەل بەستینە کۆمەلایەتییەکەیانداو لەپال یەکدا نانمان بەیارمەتیی و تەزاگەلیکی سەرەکی کە لەکۆمەلناسیی رەخنەگرانەوە وەرگیراون پیویستە (مەنزوومە)یەك پیك بێ کە لەوێ راستیی میژوویی و بابەتیانە روون و ئاشکرا ببیتەوە.

بنج و بناوانی چەمکی (مەنزومە)یان (وینەی دیالکتیکی)، وەك زۆر چەمکی فەلسەفیی دیکەی دیالکتیکی رۆشنگەری، لەبەرهەمەکانی والتر بینیامین دایە. لیکچوون و نزیکایەتیی

ئەم چەمکانە لەگەڵ وتـەزا جوانینـا سـانەکاندا هـەر لـیرەوە سەرچاوەی گرتووە. پیداچوونەوە جوانیناسانەکانی ئادۆرنۆ سـەبارەت بەوتـەزای فۆرم‌و دیـالکتیکی فـۆرم یـەکیکی دیکـە لەسەرچاوەکانی چەمکی (پارچەکان) پیك دینێ. بـەبۆچوونی ئادۆرنۆ، فۆرم وتـەزای سـەرەکیی بەرهـەمی هونەرییـەو، هــەر لەریگــەی فۆرمەوەیــە کــە کۆمــەلیك توخــم یــان پارچــەی لیکنــەچوو لەروالــەتی هامــاویکدا یەکدەگرنــەوە. هەلبــەت لیرەشـدا کیشـەی نیـوان گشـتیتی‌و پاژەکــان دەمینیتــەوەو بەراســتی لەریگــەی گەشــەپیدان‌و روونکردنــەوەی ئــەم کیشەیەوەیە کە بەرهەمی هونەری دەبیتە شوینگەی راستی. بەلام خـالی هـەرە گرنـگ لـیرەدا (بەرابـەریی فۆرمـاڵ)ی ئـەم توخمانەیە: لەبەرهەمی هونەریدا هیچ توخمیکی پـەراویزی‌و زیدەو پلەدوو یاخود هەر تەنیا رازینەرەوەیش لەگۆریدا نییە، یان، بەوتەیەکی‌تر، سـەرجەم توخم‌و پارچە پیکهینــەرەکانی بەرهەمەکە لەچەقی بەرهەمەکەوە بەیەك ئەندازە دوورن، ئەگەر لەگەڵ بۆچوونـی بینیـامیندا هـاورا بـین‌و ئـەو خالـە پەسـند بکـەین کـە لەبەرهەمـە فەلسەفییەکانیشـدا فـۆرم یـان شـکڵ شتیکی سـەربەخۆو نالەبارو دلخواز نییــە، ئینجـا پیویسـتە رەچـاوکردنی بنەواشــەی بەرابــەریی فۆرمــالی توخمــەکان لەبەرهــــەمی فەلسەفیشــدا دووپــات بکەینــــەوە. بنــــەمای دیالکتیکی رۆشنگەری راست لەســەر وەهـا بنەواشـەیەکەوە داریــژراوە. دەقــی ســەرەکیی کتیبەکــە نییــە؛ ئــەم کتیبــە پیشــەکی‌و ئــەنجامی لەخۆنــەگرتووەو تەنانــەت هــەندێ

دەستەواژەی ئاسایی وەك (هەروەها كە پێشتر وتمان) یان (هەروەها كە لەبەشی دوایی‌دا دەبینین) لەم كتێبەدا وەبەرچاوناكەون. پارچەی سێیەم‌و چوارەم هەر كام لەپارچەگەلی بچووكتر پێك هاتوون- بەڵام پارچەكانی تریش بەراستی هەر بەم شێوە نووسراون. هەر كام لەم پارچانە هەلگری مەنزوومەیەكە كە لەراڤەی دەقەكان، بیروبروا، رووداوگەلی مێژوویی‌و دامەزراوەو كردە كۆمەڵایەتییەكان پێكهاتووە. لەسەرتاسەری كتێبەكەدا پێوەندیی نێوان پارچەكان بەوردی لەلۆژیكی ناوەكیی بابەتەكەوە پەیرەوی دەكا. سروشتی مۆناد ئاسای پارچەكان هەم پارچەو بەشە سەرەكییەكان‌و هەم كورتە پارچەكان- خوێندنەوەی كتێبەكانیان تا رادەیەك دژوارتر كردۆتەوە، بەڵام كاتی خوێندنەوەی بەرهەمەكانی ئادۆرنۆ ئەبێ ئەوەمان لەبیربێ كە سەروكارمان لەتەك كۆمەڵێ پارچەو یەكەی مانایی‌دایە كە درێژایی‌یان برێ جار چەند لاپەڕەو هێندێ جاریش هەر تەنیا چەند رستەی كورت دەگرێتەوە.

بەلام تا ئەو شوێنەی پێوەندیی بەبەشی دووەمی ژێرناوی كتێبەكەوە هەبێ، كە هەمان ئاوەڵناوی (فەلسەفی)یە، ئەبێ بوترێ كە لەروانگەی تیۆری رەخنەگرانەوە جەوهەرو مەبەست‌و ئیدەی فەلسەفە شتێ نییە جگە لەراڤەكردن. یەكێك لەو خاڵە گرنگانەی كە بۆ یەكەم جار بێنیامین پەنجەی خستەسەری دووپاتكردنەوەی سروشت‌و چییەتیی نامەبەستداری (راستی)و (مانا) بوو. (واقیع) (یان بەوتەی

بنیامین (ئەزموون))و (راستی) دەچنە نێو بابەتو دیاردەکانەوە. دیاردەکان بۆ خۆیان شاراوەو لێلو لاڵنو ئەمە سووژەیەکە ئەبێ بەدەست تیوەردانی چالاکانە قوفڵی زمانەکەیان بکاتەوەو لەرێگەی یەکالاٌکردنەوەی نیشانەکانەوە (واقیع)و (راستی)ی نامەبەستدارو شاراوە لەواندا ئاشکرا بکاتەوە. ئەم (یەکالاٌکردنەوەی نیشانە)یە پێویستی بەچەشنێ خەیاڵی وردو کۆنترۆڵکراو هەیە کە لەم رێگەیەوە سووژە بەرەوچاکردنی بنەواشەی باشتربوونی بابەت (ئوبژە)، هێندە لەلۆژیکی ناوەکیی دیاردەی باسکراو دەکۆڵێتەوە کە بۆ خۆی بەگشتی دەچێتە ناخی بابەتەکەوەو، دژایەتیو پچرانە زاتییەکانی بابەتەکە لەرواڵەتی پرسیار یان مەتەڵێکدا بەرجەستە دەکرێتەوە. هەڵبەت (مەنزومە) یان (وێنەی دیالکتیکی) ئاکامو بەرهەمی جێگۆرکێو پۆلێنکردنی سەرلەنوێی توخمە بەرجەستەکراوەکانی هەمان مەتەڵە. بەپێچەوانەی بنیامین کە بەسرووش وەرگرتن لەمیتۆدی کوولاژی شێوەکاریی سووریالیستیەوە پێکهاتنی (مەنزومە)یەك لەتوخمە جۆراوجۆرەکانی بەمەبەستی تێگەیینی (شوهوودی) یان (تەجەلی)و دیتنی راستەوخۆرو بێ نێوەنجی (راستی)ی بەبەس دەزانی، ئادۆرنۆو هۆرکهایمر پێیان لەسەر دەوری پێویستی تیۆرو یارمەتیدانی تیۆر لەراڤەی بابەتو دیاردەکاندا دادەگرت. هەڵبەت، ئەم پێداگرییەی ئەمان لەسەر رەهەندی راڤەکارانە نابێ لەتەك هێرمنۆتیکی رۆمانتیکی شلایرماخرو دیلتایو ئەندامانی

قوتابخانـەی میژووییـدا بەیـەکێ دابنـدرێ؛ لەبەرئـەوەی کـە بناخەی سەرەکیی بیروراگەلی ئەم قوتابخانەیە لەسەر تیۆریك دامەزراوە کەماناکان ریوراست بەبەرهەمی مەبەستی زەین یان زەینەکان دادەنێ و، بەم بۆنەشەوە سەرجەم رەوتی تیگەیین و راڤـە لـەجۆرێ هاوکـاریی (مینۆکـی)ی نیـوان زەینـەکاندا (هاودلیی دەروونی) کۆدەکاتەوەو، لەریگەی سرینەوەی هەر چەشـنە هـەولیك بـۆ رەخنـەکاری و گـەران بـەدوای راسـتیدا ستایشـتیکی ریژەیی‌گـەراو شـیوەیی لـەفراوانی و زۆرینـەیی مانا و کولتوورەکان دەکاتە دەستووری سەرەکیی بەرنامەکەی خۆی.

روانگـەی ئـادۆرنۆو هـیرمنۆتیکی فەلسـەفی گـادامیر، سـەرەرای هـەندێ لیکچوونـی بـەرچاو وەك بەباشـتر دانـانی بابەت و رەخنـەکاریی مەبەسـتگەریتیی ماناسـانە، جیـاوازیی زۆریان پیکەوە هەیە. بنەرەتی کارەکەی گادامیر بوونناسیی هایدیگرییەکە ئادۆرنۆو هۆرکهایمر زۆر جار دژایەتیی خۆیان لەگـەلیدا دەربریـووە. ئەگـەر دیاردەناسـیی هوسـیرل وەکـو هەولیك بۆ (پاراستنی ئیدیالیزم بەبێ یارمەتیی ئایدیۆلۆژیا) دابنیین، کەواتە بوونناسی خۆی لەخۆیدا بەراستی دەربری شکستی ئەم هەولەو، گەران بۆ ئایدیۆلۆژیایە.

ئەگەر بمانەوێ بەیارمەتیی چەمك و تەزا هەنووکەییەکان وەسـفیکی پـر پیسـت لـەدیالکتیکی رۆشـنگەری ئاراسـتە بکـەین، ئـەبێ وەکـو جـۆرێ (رەچەلەکناسـیی سـووژە) یـان (رەچەلەکناسیی دەسەلات) لەبەرچاوی بگرین، ئەویش راست

وەك مانا فۆكۆییەكەی. دوای هەلویستی فۆكۆ-بەتایبەت بەرەچاوكردنی دابرانی وی لەدوا پاشماوەكانی بنەماخوازیو تیپەرین لە(دیرینەناسیی زانیاری)یەوە بۆ (رەچەلەكناسیی هیز)- لەزۆر رووەوە لەهەلویستەكەی ئادۆرنۆو هۆركهایمر ئەچێ. هەردوو تیۆرەكە بەهۆی پیوەندیی ئالۆزو رەخنەگرانە لەگەڵ فەلسەفەو زانستە كۆمەلأیەتییەكانداو رەخنەكاریی بنچینەیی میتافیزیكی هیز (كە لەهەردووكیاندا تارادەیەك لەبیروراگەلی نیچە وەرگیراوە)و نەچوونە ناو شەپۆلو قوتابخانە ناسراوەكان (پۆزیتیڤیزمو دیاردەناسی، بنەماخوازیو هیرمنۆتیك)، لەزۆر روو و لایەنەوە خاوەن دۆخیكی یەكسانو بەرابەرن. ویرای ئەمانەش، هەردوولا هەندێ رەخنەی وەكیەكیان ئاراستەكراوە، رەخنەگەلیك وەك گشتگیریو دەستنیشان نەكردنی چەمكگەلی دەسەلأتو هیز، كورتكردنەوەی هەموو شتێ بۆ دەسەلأتو هیزو ئاشكرانەبوونی بناخە بەهاییو زانستییەكانی ئەم رەخنەكارییە. بەداخەوە، مەرگی لەناكاوی فۆكۆ ئەو مۆلەتەی پێنەدا كە لەریگەی پەرەپیدانو بەربلأوتركردنەوەی میتۆدی رەچەلەكناسییەوە لەكردەشدا، ئەم لیكچوونە روونو دووپات بكاتەوە؛ سەرەرای ئەمەش، لیكدانەوەو هەلسەنگاندنی ئەم كیشەیە نەك هەر لەگۆرانكاریی دوو نەریتی ئادۆرنۆییو فۆكۆییدا بایەخدارە، بەلكو تەنانەت بۆ سەرجەم فەلسەفەش بەكەلكو سوودە-بەتایبەت بەسەرنجدان بەدەوری بیروراگەلی فۆكۆ لەبیریاریی هاوچەرخدا كە لەباری كاریگەریتیو

گرنگایەتییەوە هەر تەنیا لەگەڵ ئەوەی هابرماسدا ئەتوانرێ بەراوردبکرێ.

کەواتە بەسەرنجدان بەو وەسفەی لەم نووسینەدا ئاراستەکرا، ئەکرێ بوترێ دیالکتیکی رۆشنگەری رەخنەیەکە لەرەوتی ئامرازیبوونی ئەقڵو بەکارهینانی (ئەقڵ) لەپیناو پاراستنی خودو دەسەڵاتداریتی مرۆڤ بەسەر سروشتدا، کە لەئاکامدا بەلەناوچوونی هەمان خودو بەچشتبوونی مرۆڤو سروشت کۆتایی پیدێ. بەڵام، ویدەچێ ئەم وەسفە گشتییە پەرە بەو بیرەش بدات کە دیالکتیکی رۆشنگەری بۆ خۆی جۆرێ (گەورەگیرانەوە)یە، بەو مانایەی لیوتار بەکاری ئەهینا؛ لەکاتیکدا ئەم کتیبە لەکۆمەلیك گیرانەوەو بابەتگەلی دیارو بەرهەست پیك هاتووەو، بەشیکی هەرە زۆری هیزی بەلگەهینانەوەو هەروەها پربوونی لەباری میژووییەوە هەمدیسان قەرزداری ئەم فراوانییە بابەتییەیە. دیالکتیکی رۆشنگەری لەو جۆرە کتیبانەیە کە وەسف یاخود کورتکردنەوەیان بەوینەی گۆرینو بەهەلەبردنیانە. ئاماژەنەکردن بۆ هیندێ بابەتی سەرەکی (وەك راڤەکاریی بیروراگەلی مارکی دوساد، یان رەخنەکاریی (پیشەی کولتوور سازی))و زۆر خالی لاوەکیتر لەم نووسینەی ئیستادا (کە فرەتر لەبابەتەکانی بەشی یەکەم (ی ئەم کتیبەی) کۆلیوەتەوە) بۆ خۆی پیشاندەری ئەم راستییەیە.

دیالکتیکی رۆشنگەری لەلایەکەوە رەخنەکاریی فەلسەفییەو لەلایەکی ترەوە شیکاریی میژووییەو، بەهۆی

تایبەتمەندییە جەوهەرییەکەیەوە (Substantive) ناتوانێ بەشیوەیەکی نوێکانتی دەست بکات بەرەخنەکاریی شیوەیی (پیش مەرجەکانی ئەگەری وەدیهاتن)ی دیاردەکانو، بەردەوام لەراگەیاندنی حوکمە جەوهەریو بەرهەستەکان خۆی دەکشیتەوەو دەرباز دەکات. هەر ئەم هۆیانە بوونە سۆنگەی ئەوەی کە ئەم کتیبە لەنیو بەرهەمەکانی (قوتابخانەی فرانکفۆرت)دا جیگەو پیگەیەکی تایبەتی بدریتێو زۆرتر لەوانی دیکە هیرشی بکریتە سەر. لیرەدا هەر ئەتوانین هەندێ لەو رەخنەو هیرشە بەرچاوانەی کە ئاراستەی ئەم کتیبە کراوە بەکورتیو جیاجیا بخەینە بەر لیکۆلینەوە.

دیالکتیکی رۆشنگەری نە جۆرێ کۆمەلناسیی مۆدیرنیتەیەو نەك گیرانەوەیەکی دیکە لەفەلسەفەی میژوو؛ هەربەم بۆنەشەوە، پیوەندیی ئەم کتیبە لەگەلْ فەلسەفەو زانستە کۆمەلأیەتییەکاندا بەردەوام کیشەسازکەر بووە. لەروانگەی ئادۆرنۆو هۆرکهایمرەوە، کیشەو بەرامبەریتیی نیوان فەلسەفەو زانستە کۆمەلأیەتییەکان راستییەکی میژووییە کە ناتوانرێ وەپشتگوێ بخرێ. چارەسەرکردنی دلخوازانەی ئەم کیشەیە بەشیوەیەك کە قازانجی یەکیك لەو دوولایەنەی تیدابێ، وەکو گۆرینو بەهەلەبردنی بابەتەکەو کەوتنە ناو گیژاوی ئایدیۆلۆژیایە. فەلسەفە ئیتر ناتوانێ دەوری (پاشای زانستەکان) یان (خاوەنی زانیاریی رەها) بگیرێو چیدی ناتوانێ لەقەلأی بەرزی خۆیەوە بەسووکییەوە

بۆ زانستە كۆمەڵایەتییەكان بنواڕێ. بەوتەی ئادۆرنۆ، (ئەو كەسەی ئەورۆكە فەلسەفە وەكو كاروپیشە هەڵدەبژێرێ پێویستە لەپێشدا ئەو وەهمە بەرەوبرو دوور بكاتەوە كە خاڵی دەستپێك هەمان هەوڵە فەلسەفییە پێشوەكان بووە: ئەو وەهمەی كە هێزی بیركردنەوە بۆ تێگەینیی تەواوەتیی واقیعەكان بەسە.)[٢٨] درێژەدان بەقسەو باس لەسەر (بوون) (ئەگزیستانس) یان هەر چەمكێكی گشتیی دیكەو، سەرنج نەدانی دەستكەوتەكانی زانستە كۆمەڵایەتییەكان، كە هەندێ بابەتی پێویست بۆ راڤەكاریی فەلسەفی دیننە ئاراوە، فەلسەفە دەگۆڕێ و دەیكات بەوەهمیكی پەتی. هەر فەلسەفەیەك خۆی لەروانگە رەخنەگرانەكانی مێژوو، دەروونشیكاری، كۆمەڵناسی و دەروونناسیی ناسینەوە بێبەش بكات، بەراستی كاتێ رووبەرووی دژایەتی و كێشە ناوەكییەكانی خۆی دەبێتە خێراو بەپەلە هەڵدێ. بەڵام، رێگەی چارەسەریی دژ بەو خاڵەی پێشوو، واتە گۆڕینی فەلسەفە بۆ پاشكۆی زانستەكان و دابەزاندنی بۆ میتۆدۆلۆژی و مەعریفەناسی، بەمانای كورنشت بردن بۆ پۆزیتیڤیزمو هەروەها پەسەندو ستایشتكردنی ئاوەزئامرازییە. ئەو فەلسەفەیەی كە نەباری و بێبەریی خۆی لەپشت دەمامكی (میتۆدی زانستی)یەوە حەشار دەدا، شتێ نییە جگە لەجۆرێ (پیشەی ئاكادیمیك) یان ئامرازیكی كەم تا زۆر ئاڵۆزو پێچراو بۆ ژیان بردنە سەر. فەلسەفەی هاوچەرخ هەردوو رێگەكەی شان بەشانی یەك پێواوە. بەڵام، رێگە

چارەسەرییەکی سێیەمیش لەگۆڕیدایە کە لەم دوانە درۆیی‌ترو بێمایەترو وەهماویترە: لینانی چیشتێکی تێکەڵاو لەفەلسەفەو زانستە کۆمەڵایەتی و سروشتییەکان کە بەردەوام ئەکرێ مادەو شتومەکەکانی بەگوێرەی تام و چێژی تاکەکان بگۆردرێ. ئەم بابەتە تیکەڵ و پێکەڵ و سەیرە، کە زۆرتر بەناونیشانی (مرۆڤناسیی فەلسەفی)یەوە چێ و ئاراستەدەکرێ، بەبێ ئەوەی کیشەکان چارەسەر بکات وەڵامی هەموو شتێ دەداتەوە. دیالکتیکی رۆشنگەری لەهەمبەر هەرسێ ریگە چارەسەرییەکەوە رادەوەستێ و نرخی وەها بەرگرییەکیش بەپەسندکردنی تاوانەکانی ئەقلی خاوین دەداتەوە، ئەقلیك کە هەر تەنیا لیرەو لەئیستا دەژی و هیچ کاتی ئەو بانگ و دەنگانەی لەیۆتۆپیاکانەوە (utopia، ناشوین ئاوا) بەرزدەبنەوە نابیستێ. راڤەگەلی دیالکتیکی رۆشنگەری هەر لەناخی کیشەی نیوان فەلسەفەو زانستە کۆمەڵایەتییەکانەوە هەستاوەتەوەو بەردەوامیش دەگەریتەوە بۆ بەستین و ئاقاری هەمان کیشە. هیچ گوتاریك ناتوانێ، بەبێ ئەوەی پارچە پارچە بێ، لەبەستینی پرشەپۆلی ئەم کیشە میژووییەدا بمینیتەوەو، ئەمەش خۆی لەخۆیدا هەمان نرخی نزیکایەتی لەگەڵ راستییە.

دووەمین خالی گرنگ بریتییە لەپیوەندیی تیۆری رەخنەگرانە بەمارکیزمەوەو ئاکامەکانی ئەو پیوەندییە. هەلبەت گومانی تیدا نییە کە دیالکتیکی رۆشنگەری بەگشتی دەچیتە نیو شەپۆلی بیریاریی سۆسیالیستی و رزگارکەرەوەو،

سەرجەم هیرشەکانی دژی ئاوەزئامرازی بوو نەك خودی رۆشنگەری. ئادۆرنۆو هۆرکهایمر ئوستووره سرینەوەو رەخنەکاریی باوەرە میتافیزیکییەکان و وەدەستهێنانی خودئاییینی و سەربەخۆیی تاك لەچنگی نەریت بەمەرجی پێویستی رزگاریی مرۆڤ و کۆمەڵگای مرۆیی دادەنێن؛ ئەمەش راست بەپێچەوانەی بیروراگەلی کەسانیك وەك شپنگلەر، یونگر، سومبارت و هایدیگر-ە. هەر لەبەر ئاوا هۆیەك نابێ چاوپۆشی لەجیاوازیی ئەم دوانەو رەخنەگرە نەرمرۆکانی مۆدیرنیتە بکرێ کە، بەراشکاوی یان ناراستەوخۆ، خوازیاری گەرانەوە بۆ سەردەمی کۆن و روانینی ئوستوورەیین. تیگەینی راستەقینەی پیوەندیی تیۆری رەخنەگرانە بەمارکیزمەوە پێویستی بەلیکدانەوەو هەڵسەنگاندنی گۆرانکاریی فیکریی سەرجەم ئەندامانی قوتابخانەی فرانکفۆرت و خۆدەربازکردن لەبازنەی گیرانەوە گشتی و بەبرەوەکانی ناو کتیبگەلی میژووی بیروبروا هەیە. بەپیی ئەم گیرانەوەیە، کە زۆرتر لەسەردەستی کەسانیك سەردەگرێ کە دەیانەوێ تیۆری رەخنەگرانە بۆ بابەتیکی ریکوپیکی وانە وتنەوەی زانکۆیی و یان نووسینی نامەیەکی دوکتۆرا بگۆرنەوە، ئەندیشەی زاڵی قوتابخانەی فرانکفۆرت هەر لەدەستپیکەوە جۆرێ مارکیزی هیگلی بوو کە زۆرتر لەلووکاچ-ەوە کاریگەریتی و سروشتی وەرگرتبوو و، ئەیەویست لەریگەی رەخنەکاریی دیاردە کولتووری و روونبەماییەکانەوە هۆکانی شکستی راپەرین لەوڵاتە

پیشەسازییە پیشکەوتووەکاندا ئاشکراو دەست نیشان بکات. سەرکەوتنی فاشیزمو مسۆگەربوونی ستالینیزم خۆی لەخۆیدا جۆرێ شۆك یان زرمەی میژوویی بوو کە ئەندامانی ئەم قوتابخانەیەی ناچارکرد تاکو تیۆرەکەی مارکس دەربارەی سروشتو چییەتیی شۆرشگیرانەی پرۆلتاریا وەلانینو، هەروەهاش، راڤەکەی لووکاچ لەم چینە وەکو سووژ–ئوبژەی ئەمئەوی میژوو وەپشتگوێ بخەنو زۆرتر گرنگایەتی بدەن بەتیۆرە رەشبینانەکەی ڤیبیر سەبارەت بە(قەفەسی ئاسنین)ی کۆمەلگای بورژوازی. دوائاکامو ئەنجامی وەرچەرخانە، بەوتی مارتین جەی، جۆرێ (نائومیدیی تاکرەهەندی) بوو کە ئاکامەکانی لەتیۆری بەچشت بوونی گشتییداو چەمکگەلیك وەك (پیشەی کولتوورسازی)، (کۆمەلگای تاکرەهەندی)و (کولتووری جەماوەری) رەنگیدایەوە. بەدگومانیی تیۆری رەخنەگرانە سەبارەت بەهەر چەشنە سووژەیەکی کۆیی بوو بەکۆسپ لەبەردەم پەرەسەندنی تیۆریکی نوێ لەمەر کردەی سیاسیی شۆرشگیرانە. کەواتە، بەم شیوەیە ئیتر ریگەیەك نەماوە جگە لەهەنگاو هەلهینان بەرەولای بواری بیریاریو فەلسەفەی خاوینو، لەئاکامیشدا، پەنابردن بۆ ئاقاری جوانیناسی؛ چونکە لەوەها دۆخیکدا بەرهەمی هونەریی مۆدیرن بەتەنیا جیگەی وەدیارکەوتنی (راستی) دادەنرێ.

ئەو گیرانەوەی سەرەوە دەربارەی هیچ کام لەئەندامانی قوتابخانەی فرانکفۆرت بەتەواوەتی راست نییەو تا ئەو

جیگەیەی پیوەندیی بەئادۆرنۆوە هەبێ، تارادەیەك سەرلەبەر هەلەشە. ئادۆرنۆ هیچ کات ئەندامی هیچ جزب و ریکخراوەیەك نەبوو و، هەر لەسەرەتاوە روانگەکەشی لەهەموو گیرانەوەکانی دیکەی مارکسیزم جیاواز بوو، بەتایبەت لەمارکیزی هیگلیی لووکاچ. سەرومری هەلویست و بیرورا فەلسەفییەکانی ئامادە لەدیالکتیکی رۆشنگەری دا تا رادەیەك لەیەکەمین لیدوانی ئادۆرنۆ لەئەنستیتۆی لیکۆلینەوە کۆمەڵایەتییەکانی فرانکفۆرت لەسالی ١٩٣١دا بەشیوەیەکی راشکاوانە یاخود پەراویزی دەرکەوتووە[٢٩]. سەبارەت بەتاوانی (رەشبینی و هەلرسکاوی)یش پیویستە بوترێ کە ئەم ئاواتانە[٤٦]، کە زۆرتر خاوەن سروشتیکی سیاسی و پروپاگەندەیین، بەهۆی چەوت تیگەیشتن و نەبوونی ئاشنایەتییەکی قوول لەگەڵ بیروراگەلی ئادۆرنۆ، گرنگتر لەمانەش، بەهۆی جۆرێ ویناکردنی پر رەمزورازو هەلرسکاو دەربارەی کردەی سیاسییەوە ئاماژەیان پیکراوە و پەرەیان پیدراوە. ئەم تاوانانە خاوەن بناخەیەکی تیۆریك نین چونکە لەکاتیکدا کە مارکسیستە ئۆرتۆدۆکسەکان و بزووتنەوەی خویندکاری و چەپگەرای دەیەی ١٩٦٠، (رەشبینی و هەلرسکاوی)ی ئادۆرنۆیان بەنیشانەی پچران و یاخود گۆرینی روانگەکەی سەبارەت بەمارکسیزم لەقەلم دەدا، هەندێ بیرمەندی لیبراڵ وەك مارتین جەی هەر ئەم بابەتەیان بەدەرئەنجامی نەپچران لەمارکسیزم دەزانی. رەوتی ئالوگۆرو رووداوە میژووییەکانیش ئەوەیان پیشانداوە کە رەخنەکانی

ئـــادۆرنۆ لەبزوتنەوەگـــەلی خویندکـــاریی دەیـــەی ١٩٦٠، بەتايبەت دەربارەی (هەلرسکاوی)و (رق لەتیۆر)، بەتـەواوی بـــەجێ و واقیعبینانـــە بـــووە. ســـەبارەت بـــە(هـــەلاّتن بـــۆ جوانیناسی)یش پیویسته ئەم خاله بدرکینـدرێ کە ئادۆرنۆ، هەر لەهەمان دەستپیکی نووسینیەوە، گرنگایـەتیی تایبـەتو بـــەردەوامی بەبابەتـــە جوانیناســـانەکان دەدا، کـــە ئەمـــەش لەبەرهـــەمی یەکـەمیدا، کیـەرکیگور: بنیاتنـــانی جوانیناســـی (١٩٣٣)، بەراشکاوی رەنگی‌داوەتـەوە. بەپیچەوانـەی زۆریـك لەبیرمەندە راستو چەپگەراکان وەك هایدیگرو کویستلر، کە دوابـــەدوای ئـــەزموونی تـــالی ئاریکـــاریی و بەشـــداریکردن لەسیاسەتداو دامان لەبزوتنەوەی جەماوەری، روویان هینایە تیکـەلاّویك لـــەعیرفانو جوانیناســـی و لـــەپال کەشـــوهەوای خاوینو مینۆکیی هونەردا خەریکی ساریژکردنی برینەکانیان بوون، ئادۆرنۆ بەردەوام هەولیدەدا تاکو دەوری رەخنەگرانە، دژە ئـــایدیۆلۆژیك، هەژینـــەرو هـــەرە کاریگـــەری بەرهـــەمی هونـــەریی مۆدیـــرن دووپـــات بکاتـــەوە. بـــەبروای ئـــادۆرنۆ، کۆتـــایی و ئاکـــامی دیـــالکتیکی ئاقـــاری جوانیناســـی (لەبیرچوونـەوەی جیهانی ئیستا لەخەونـەکاندا نییـە، بـەلکو گۆرینی ئەم جیهانە لەریگـەی هیزو وزەیـەکی شاراوە لەیەك وینە)دایە، ئاقاری جوانیناسی (هـەمان بەستینی دەرکـەوتنی دیالکتیکییـــە، کـــە لـــەوێ (راســـتی) لەریگـــەی لـــەناوچوونی هەستییەوەو لەباری میژووییەوە بانگەشەی بۆ دەکریت.)[٣٠]

سەرەرای ئەو خاڵانەی سەرەوە، چەند رەخنەیەکی سەرەکیی دیکەش لەلایەن هابرماس، پیکوونە، وۆلمیرو کەسانیترەوە ئاراستە کراوە کە لەهەردوو باری ناسینی بەرهەمەکانی ئادۆرنۆو ئالۆزیو پتەویی تیۆریکەوە لەئاستیکی گەلیك سەرتردان. لەبەرئەوەی هەندێ تایبەتمەندیی دیکەی دیالکتیکی رۆشنگەری روون بیتەوە، ئاوریکی خیرای خالە سەرەکییەکانی ئەم جۆرە رەخنانە دەدەینەوە.

پۆل پیکوونە بەرەچاوکردنی بەرهەمە دواییەکانی هوسیرل و دیاردەناسیی میرلۆپۆنتی ئەم بیروبۆچوونەی ئاراستە کردووە کە مارکسیزم لەبنەرەتدا تیۆریکی عەینیگەرایەو ئادۆرنۆش بەهۆی پیبەندبوون بەهیندێ بابەتی بناخەیی لووکاچی-یەوە- وەك بابەتی (چشتئاسایی)- یان مانەوە لەچوارچیوەی تیۆریکی مارکسیزمدا، نەیتوانیوە بەسەر عەینیگەریتی حەشاردراو لەبیروراکانی خۆیدا زاڵ بێ[٣١]. بەبروای پیکوونە، لەدیالکتیکی رۆشنگەریدا ئەم عەینیگەریتییە لەرواڵەتی دووپاتکردنەوەی بنەواشەی دەسەلات وەکو وتەزایەکی گشتی و بنەرەتی و زاڵ بەسەرسەرجەم میژووی شارستانیتیی مرۆییدا وەدەرکەوتووە. لەوەلامی ئەم رەخنەیەدا ئەتوانین بۆ ئەو وتەیەی ئادۆرنۆ ئاماژەبکەین کە مەبەستی وی بەکارهینانی توانستە ناوەکییەکانی خودی سووژەیە دژی بنەواشەی دەسەلاتداریتیی سووژەو سووژەییخوازی (subjectivism).

جگـه لـەوەش، هـەروەها کـە راڤـە نویکـانی بەرهەمـەکانی ئادۆرنۆ–بەتایبەت ئەوانەی خاتوو شیری ڤیبیر نیکلسۆن– پیشـانیداوە ئـادۆرنۆ بـەهیچ شـیوەیەك رەهـەندی زەینیـی ئەزموونی مرۆیی وەپشتگوێ نەخستووە. ویـرای ئەمـە، دوا وەلام پیویسـتی بەتیگـەیینی راسـتەقینەی بنەواشـەی باشـتربوونی بابـەت یـان عـەین هەیـە کەپیکوونـە، وادیـارە، بەهەلـە ئەمـەی لەگـەڵ عەینیگـەریتیدا بەیـەکێ دانـاوە. لەروانگـەی ئـادۆرنۆوە بەباشـتر دانـانی بابـەت واتـە تایبەتمـەندیی سـەرەکیی ئـەو ئەندیشـەیەی خـۆی لەبـەندی ئیدیـالیزم بـەواقیع دەربـازکردووە[٣٣]. بـەلام، لای ئـەو شـیوە بیرپارییـە کـە (مانـا)و (راسـتی) بەشـتگەلیکی سەرانسـەر میژوویـی دادەنـێ، بەباشـتردانانی بابـەت شـتێ نییـە جگـە لەبەباشتر دانانی میژوو؛ چونکە ئەمە بەراستی میژوویەکـە نەك هەر بابەتەکە بەلکو تەنانـەت ئاسـۆو ئامرازی راڤەکەشـی ئاراستەی بیردارۆ تیۆرزانو فەلسەفەکار دەکات. گرنگایەتیو ئامـادەبوونی گشـتگیری بابـەتی دەسـەلات لـەدیالکتیکی رۆشـنگەریدا بـەهۆی خۆدانەدەسـتی واقیعیکـی میژووییەوەیە. هەر لەبەر ئاوا هۆیەك، دیالکتیکی رۆشنگەری لەپیگـەی رەچەلەکناسـی دەسـەلاتدا بـەردەوام پـاریزی لـەوەکردووە کـە دەسـەلات بـۆ وتەزایـەکی بنـەرەتیو بووننـاسـانە، وەك (رۆحـی رەهـا) (هیگـل) یـان (بوونـی چەشنی)و (وزە بەرهـەم هینـەرەکان) (مـارکس) بگۆریتـەوە. ئـادۆرنۆو هۆرکـهایمر بەراشـکاوی ئـەوەیان دەربریـوە کـە

گۆرانکــاریی ژیــارو شارســتانیتی و کۆمــەلگای مرۆیـــی ئــەیتوانی و مەشــیایە لــەبری دەســەڵات بەســەر سروشـــت و ناوەکیکردنـەوەی توندوتیـژی، ریگەیـەکی دیکـەی بگرتایەتـە بــەرو شــیوەیەکی جیــاواز لەیەکپارچـــەیی کۆمەڵایـــەتی و بەکۆمـــەلگابوونی هینابایەتـــە دی. لەلایـــەکی تریشـــەوە، ســەبارەت بــەپیوەندیی تیــۆری رەخنەگرانــە بەمارکســیزم و دیاردەناسییەوە ئەبێ بوترێ کە لـەم بوارەدا هیشتا جیگـەی باس و لیکۆلینەوە زۆرە؛ هەولدان بۆ کاملکردن (یان گۆرین)ی مارکسیزم بۆ دیاردەناسـی و، پرکردنـەوەی بۆشاییی تیـۆری سووژە لەبیروراکانی مارکسدا هینـدەش سـەرکەوتوو نـەبووە. بەرهـەحاڵ، لەوانەیـە ئادۆرنۆ لەگـەڵ ئـەم بۆچوونـەی فۆکـۆدا هـاورا ئـەبوو کـە تەنانـەت دیاردەناسـیی مـیرلۆپۆنتی–یــش ناتوانێ بەبێ چوونـە نـاو دژایەتییەکانـەوە بـوون و زانیـاریی مرۆیـی لەسـەر بناخـەی (ژیـان–جیـهان)، (ئـەزموونی نیـوان زەینی) یان (دیاردەناسیی هەستەکان) دابمەزرینێ. سەبارەت بەپیوەندیی ئادۆرنۆ بەمارکس–یشەوە پیویستە ئاماژە بەوە بکرێ کە ئەو لەگەڵ گۆرینی کاروبەرهـەم هینان بۆ نموونـە گـەلیکی بناخـەیی بووننـاسـانەو مرۆڤناسـانە، کــە هیگــل و مــارکس و لووکــاچ هەرســیکیان لــەلاویتیدا پییــان لەســەر دادەگرت، بەردەوام دژایەتیی خۆی دەردەبری.[٣٣]

ئادۆرنۆ تەنانـەت بەپشت بەستن بەبەرهەمـە دواییـەکانی مـــارکس وەك بەرنامـــەی گووتـــا و ســـەرمایە و بۆچوونـــی سەرانســەر ئــابووریی و کۆمەلناســانەی ئــەو بەرهەمانــە بــۆ

بابەتی (کار)، راڤەکارییە مرۆڤناسانەکانی مارکسی لاوی سەر وتەزای (کار)و هەروەها چەمکگەلی (نامۆیی)و (چێشتئاساییی) خستۆتە بەر تیشکی رەخنەو هەلسەنگاندنەوە.[٣٤] جگە لەمانەش، زۆرتر لەوەی کە حەزی لەدووپات یان نەفیکردنەوەی هاماوی تیۆری مارکسیستی کردبێ، سوودی تەواوی لەچەند بەشیکی ئەو تیۆرە بینیوە، ئەمەش بەهۆی ناوەرۆکی راستگۆیانەی بەشیك لەو تیۆرە بوو کە هیشتا کارکردنی رەخنەگرانەی هەبوو. سەرەرای ئەمانەش، لەویوە کە ئەم مەسەلەیە لەبنەرەتدا سروشتیکی میژوویی هەبووەو بەپیی گۆرانکارییەکانی واقیعی کۆمەڵایەتی ئەگۆردرێ، ئیتر نابێ جیی سەرسوورمانو واق ورمان بێ کە لەهەندێ خالدا وەك تیۆری بایەخی کار بیروراو هەلبژاردنەکەی ئادۆرنۆ چیتر ئەورۆکە پەسند نەکرێ.

گرنگترین خالّ لەرەخنەکەی هابرماس لەدیالکتیکی رۆشنگەری بیگومان نەبوونی بناخە بەهایی و نۆرمییەکانە، واتە هەمان پیوەرگەلی رەخنەی ئەقلانی کە هابرماس لەبنەمای زمانو کردەی پیوەندیدا بەدوایاندا دەگەرێ. لەلایەکی ترەوە، رەچەلەکناسی لەبنەرەتدا بیبناخەیەو، بەراستی، وەکو مانای راستەقینەی خودی وشەکە، گوتاریکی بێ سەروبنو ناتەواو و بێ کۆتاییە کە فۆرمەکانی خۆی بەشیوەیەکی بەرهەستو لەکاتی وەدووکەوتنی شوین پیی بابەتەکە لەکەلاوەکانی میژوودا وەدەست دەهینێ. دەربارەی پیوەندیی رەچەلەکناسی بەمیژووشەوە. فۆکۆ هیشتا

نەیتوانی هەندی شتی دیکە لەبینیامین و ئادۆرنۆوە فیربێ، چونکە بەباوەری ئەو دوانە، ئەم پیوەندییە بەدەست پیشخەری و نیوەنجیتی تیۆلۆژییەوە دیتەدی. هەر تەنیا لەریگەی وردبوونەوە لەکارە دونیاییەکان و لەروانگەی ئازادی و رزگارییەوەیە کە تیۆر ئەتوانێ بەشیوەیەکی راستەقینە رەخنەگرانە بێ. ئەم پیوەندییە لەهەرسێ رەهەندی داهاتوو، رابردوو و ئیستادا وەدیدیت، هەرچەندە دەوری کاریگەرو شویندانەری تیۆلۆژیی یەهوودی–مەسیحی زۆرتر بۆ دوو رەهەندی یەکەم ئەگەریتەوە. لەرەهەندی ئیستادا، گیرانەوەکەی ئادۆرنۆو بینیامین و هۆرکهایمر زۆرتر لەبیروراکانی هابرماس نزیکایەتی بەراڤە کۆنەکەی مارکس لەتیۆری شۆرشگیرانەوە هەیە؛ راڤەیەکە کە بەوپییە تیۆر هەر تەنیا شیوەی هۆشیارانەی دەربرینی خواست و پیداویستییە واقیعییەکانی خەلکەو، رەگ و ریشەیی پیوەرو نۆرمەکانیشی هەر لەخەباتی هەمان خەلکدایە سەبارەت بەرابردووش، بەوتەی والتر بینیامین، هەر نەوەیەك هەلگری جۆرێ هیزو ئەرکی نیوەنجگەریتییەکە لەرەنج و ئازادی نەوەی پیشوو و ئومیدو خواستە بەبا چووەکانی ئەواندا ریشەی داکوتاوە؛ ئەو رەنجەی کە دەربرین و خستنەرووی پیویستی بەئامادەبوونی گویگرو پیوەندیی نیوان زەینەکان نییە، چونکە خۆی لەخۆیدا جۆریك دەربرینە، یان، لانی کەم نزیکایەتییەکی ناوەکیی لەگەلیدا هەیە. داهاتووش بەهۆی واتای کەلامیی (کۆتایی جیهان)ەوەو یاخود لەبەر (یۆتوپیای سەرزەمین مەلەکووت) بەردەوام بۆ ناوەوەی هیلی رەخنەی رزگاریبەخش دەکیشرێ، هەروەها کە هۆرکهایمر لەبارەی

کورتە میژووی گۆرانکاریی تیۆری رەخنەگرانەوە دەبیژێ: (پەل هاویشتن بۆ واقیعیکی سەرانەسەر جیاواز لەجیهانی (بووندار) لەبنەرەتدا لەسەر ئەنگیزەیەکی کۆمەلأیەتی- فەلسەفی دامەزراوە. ئەمەش، لەئاکامدا، بووە هۆی هەلسەنگاندنی ئیجابیتر لەهیندێ لقوپۆپی میتافیزیکی، چونکە (هاماو یان گشتیتی) لەباری ئەزموونییەوە (درۆییە) (ئادۆرنۆ). ئەم ئومیدەکە دواقسەی هی ترسی زەمینییە، بیگومان، خواستیکی نازانستیانەیە)[٣٩].

هەروەها کە لەپیشەکیی چاپی دووەمی ديالكتيكي رۆشنگەری دا ئاماژەی بۆ کراوە، دەسەلأت و توندوتیژی ئەتوانێ دوای هیتلەرو تەنانەت لەوپەری شەرو دیکتاتۆریشەوە هەر دریژەی هەبێ، بەلأم رەخنەی تیۆریك و خەباتی کردەیی دژی ئەمانە لەهەر هەلومەرجیکدا لەئاکامدا هیچ پیوەرو نۆرمیکی بنچینەیی نییە، مەگەر ئەو ئومیدو چاوەروانییە کە لەناخی میژوو و هاودەردی لەگەڵ میژووەوە هەلدەستیتەوە. تەنانەت دژایەتییە ناوەکییەکانی ئەقلیش پیویستە لەپیشدا لەناخی واقیعی میژووییدا بتویتەوە، تاکو بەم شیوەیە دوایی بکرێ تیۆریکی بەتاڵ لەهەر چەشنە داژیەتییەك سەبارەت بەئەقلأنییەت وەدەست بهینریت. دریژەدانی بیرکردنەوە لەناو چەمکەکان و دژی چەمکەکان، خۆدانەدەستی دژایەتی و کیشەو بەشیوەیەکی هۆشیارانەو دریژەدان بەرەخنەی میژوویی بابەتە بەرهەستەکان هیشتاش هەر روونترین پیوەرگەلی وەفای راستەقینە بەئارمانجی رۆشنگەرییە.

## پەراویزەکان:

١-میــــژوو بـــــەردەوام لەروانگــــەی ســـــەرکەوتووان و دەسەڵاتدارانەوە ئەنووسریتەوە، بەڵام وەحشیگەریی شاراوە لەئەقلییەتیاندا زۆربەی کات پەل کوتان و بۆ درۆوتن و ریاکاری بەپیویست دەزانی. تا بەئەمرۆ هەمووان، تەنانەت لایەنگرانی ئاشتی و سرینەوەی چەکە ئەتۆمییەکان، بۆ راگەیاندنی پەیامی خۆیان هەموو سالیك لەهیرۆشیما کۆدەبنەوە و لەگەڵ راگەیینەرەکانی دەنگوباسی جیهان لەبیدەنگ کردنی تەقینەوەکەی شاری ناکازاکی هاوکاری دەکەن. چونکە هۆی سەرەکیی بۆمبابارانکردنی ناکازاکی کەمبوونی بەلگەو پیداویستی زانیاران و فەرماندە ئەزموونگەراکان بەئەنجامدانی (تاقیکردنەوەیەکی زانستی)ی دیکە بوو، نەك کۆتایی هاتنی خیرای شەر. هەر ئەم خالەش دەربارەی بیدەنگی گشتی سەبارەت بەبۆمبابارانی نائەتۆمیی شارەکانی ئەلمانیا لەدوارۆژەکانی شەردا راستەو بەئیمرۆ کەم کەس ئاگاداری ئەو راستییەیە کە لەدیرسدن-ی ئەلمانیا لەدەوروبەری سێ سەد هەزار کەس،واتە دوو ئەوەندی قوربانییەکانی هیرۆشیما، بەهۆی ئەو بۆمبابارانە نائەتۆمیانەوە کوژران.

2-J.Habermas, philosophical-political profiles, Heinemann, 1983, p,100.

٣-فردریش نیچە، (در باب حقیقت و دروغ بەمفهومی غیراخلاقی) فعلنامه ارغنون، شماره ٣، پاییز ١٣٧٣، ص١٢٥.

٤-اديان جهان باستان، تأليف واقتباس مراد فرهادپور، يوسف ابازرى، مؤسسه مطالعات وتحقيقات فرهنگى، تهران، ١٣٧٣، ص٢١٩.

٥-هما نجا، ص٢٢١.

٦-لەهەمبەر ئوستوورەو تراژیدیدا جۆریکی سێیەمیش لەگۆریدایە کە هەم لەباری ئەدەبی و هەم لەرووی میژووی خەبات بۆ رزگارییەوە زۆر گرنگو سەرنج راکیشە: چیرۆکی پەریانو ئەفسانە جەماوەرییەکان. پالەوانەکانی ئەم چیرۆکانە زۆربەی کات منداڵەکەم تەمەنەکانو گەمژە راستکارەکانو هەندێ جاریش تەنانەت (فیل)و (دزیوو ناشیرین)ن. بەڵام ئەمانە بەبێ یارمەتیی توانا مرۆییەکانی خۆیانو بێ قوربانیکردنی خۆیانو دیترانو تەنانەت بەبێ ناوەکیکردنەوەو خۆبەراوردکردن لەگەڵ ترس دا بەسەر دەسەڵاتی هێزە کۆمەڵایەتییەکان (پاشاکان)و هێزە ئوستوورەییەکاندا زاڵ دەبنو هیواو خەونی ژیانیکی باشو راستکاریو بەختەوەریی مرۆییو ئاشتی لەگەڵ سروشت دیننەدی. والتر بینیامین، کە چیرۆکی پەریان بەیەکەمین ئامۆژگاری مرۆڤایەتیو مامۆستای تاهەتاییی منداڵان دادەنێ، لەم بارەیەوە دەڵێ: (هەرکاتێ پیویست بەمۆژیارییەکی باش بوو، لەچیرۆکی پەریاندا ئەیاندۆزیەوەو لەهەرکوێ پیداویستی زۆرتر لەئارادابوو، یارمەتیدانی نزیکترو لەبەردەستدابوو. چیرۆکی پەریان جۆمان باس لەیەکەمین تەکنیکو هونەرەکانی مرۆڤ بۆ رزگاری لەچنگ

چارەنووسیك دەكا كە ئوستوورە لەسەرسنگی دایكوتابوو؛ چیرۆكی پەریان لەسیمای كەسیتیی (گەمژە)دا ئەوەمان پیشاندرا كە مرۆڤ بەچ شیوەیەك لەرووبەرووبوونەوە لەگەڵ ئوستوورەدا بە(فیلبازی)یەوە هەلسوكەوت دەكا؛ لەكەسیتی (بچووكترین برا)دا ئەو خالە ئاشكرا دەكاتەوە كە چلۆن چارەنووس‌و بەختی مرۆڤ، هاوكات لەگەڵ دەربازبوون لەسەردەمە سەرەتاییە ئوستوورەییەكان، روو لەزیادبوون دەكا؛ لەسیمای ئەو پیاوەشدا كە هەولدەدا لەمانای ترس تیبگات ئەوەمان پیشان دەدا كە بە چ شیوەیەك ئەكریٚ چاو لەناخی ئەو شتانە بكەین كە بوونەتە هۆی ترس‌و هەراسمان، لەكەسیتی ئەوانەی دا كە ئیدعای ئەقڵ‌و ئاوەزیان هەیە ئەو خالەمان بۆ رووندەكاتەوە كە ئەو پرسیارانەی ئوستوورە ئاراستەی كردووین، وەك مەتەلی ئەبولهەول (یان قەقنەس)، چەندە پرسیارگەلیكی ساكارو بیٚناوەرۆكی؛ لەروالەتی ئەو حەیوانانەشدا كە لەچیرۆكی پەریاندا وە مانای منداڵانەوە دین ئەو خالەمان پیشاندەدا كە سروشت نەك هەر خزمەتگوزاری ئوستوورە نییە، بەلكو ئەوەش بەباش دەزانیٚ كە لەگەڵ مرۆڤ هاوسازو هاوریٚ بیٚ. ئەقلانیترین شت (رووبەرووبونەوەی زیرەكانەو ئازایانە لەگەڵ هیزەكانی جیهانی ئوستوورەیی‌دایە) ر.ك.بە: والتر بنیامین، (قصەگو) در فعلنامە ارغنون، شمارە ٩-١٠، تابستان ١٣٧٥،صص ١٨-١٩.

7
Kierkegaard: Constrution of the Aesthetic, Vniversity of Minnesota press, Minneapolis, 1989, p.x.

٨–دەربارەی (فەلسەفەی میژوو)ی ڤیکۆو جیاوازیی لەگەڵ ئەندیشەی دەرهەستو نامیژوویی دیکارت بروانە بۆ: ماکس هورکهایمر، (سپیدەدمان فلسفه تاریخ بورژوایی)، ترجمه محمد پوینده، فعلنا مه ارغنون، شماره ١، بهار ١٣٧٣، ص ١٦١–١٩٣.

٩–تیۆرو قسەوباسە فراوانو زۆربەی کات ساکارەکانی سەدەی هەژدەهەم لەسەر سەرچاوگەی زمان دەربری هەر ئەم شتەیە. تیۆرەکەی ڤیتگنشتاین دەربارەی سەرنەگرتنی داهینانی زمانیکی تایبەتیش پیشاندەری نەبوونی ئەگەری چارەسەریی (ئەقلانی)ی ئەم مەتەلەیە.

١٠–تیۆرەکەی ڤیبیر سەبارەت بەپیوەندیی ئاکاری پرۆتیستانی بەرۆحی سەرمایەدارییەوە بەوردی پەنجەی خستۆتە سەر پیوەندیی نیوان دەسەلاتی ئەقلانی بەسەر سروشتی ناوەکیدا لەلایەکەوە (وەك پارسایی و دینداریو نەزمی ئاکاری)و، دەسەلاتی ئەقلانی بەسەر سروشتی دەرەکیدا لەلایەکی ترەوە (وەك پەرەسەندنی پیشەسازیو تەکنۆلۆژیا).

11-T.W.Adorno, Aesthetic Theory, R.K.P, London, 1988, p.162.

12-Arnold Hauser, The Social History of Art .R.K.P., London, 1977, Vol.I,p.2.

13-Ibid., p.4.

14-Ibid., p.7.

14-Ibid., p.8.

16-Ibid.
17-Ibid., p.11.

١٨-بەوتـــەی نۆڤــالیس، (خودیتـــی بناخـــەی هـــەر چەشنەزانیارییەکە)؛ هـەموو چشـتو بابەتـەکانی زانیـاری بـۆ خۆیان خاوەن خودو ورەی بیرکردنەوەن: (ئەو شتەی بتوانرێ لەبارەیەوە بیربکریتەوە بۆ خۆشی بیردەکاتـەوە). ناسـینەوەی هەرشـتێ لەسـەر خودناسـیی ئـەو شـتە دامـەزراوەو لـیرەوە سـەرجەم زانیـاری هـــەمان زانیـــاریی دەربـــارەی خـــودی بوونەوەریکی بیرمەند یان هەمان (کاری رەها)یە. بۆ راڤەیەکی ورد سـەبارەت بـەروانینی رۆمانتیکـەکان بـۆ سروشـت، بروانـە بۆ:
Selected Writings, Marvard University press, 1996.

19-J.Habermas, op.cit., p.100.
20-Ibid., pp.100-101.
21-See fredrick (opleston, A History of philosophy, Image Books, Vol.I, pp. 66-67.

٢٢-بروانە بۆ: فردریش نیچە، (خواست قدرت) (گزیدئە مارك تیلور)، ترجمە میترارکنی، مجلە فرهنگ، کتاب پانزدهم، پاییز ١٣٧٢، ص ٥٣.

23-Martin Heidegger, Being and Time, Basil Blackwell, Oxford, 1967, pp. 123-127.

٢٤-ماوەیەکی زۆر بەرلەژاك دریدا، ئـادۆرنۆ ئاماژەی بـەم خالـە کردبـوو کـە دژایـەتی کیشـەگەلی نـاوەرۆکی و نـاوەکیی سیستەمە فەلسەفییەکان بەهۆی پیوەندیی دیالکتیکی فۆرمو ناوەرۆکـەوە، زۆربـەی کات لەروالـەتی شـتگەلیکی شـیوەیی و لەپـــەراویزی سیســـتەمدا وەدیدیـــن. ئامـــاژەی زیرەکانـــەی

هوسيرل بۆ بابەتی سەرەكیی فراوانیی سووژە یان خودەكان (Egos) نموونـەی بـەرچاوی ئەمەیـە. هوسـیرل لەپـەراویزی خۆیـدا بـۆ نوسـخەی چـاپیی كتێبـی ئیدەكـان دەنوسـێ: (بـەردەوام باشـتر وایـە بـاس لـەفراوانیی خودەكـان(Egos) ئەكرێ، جگە لەوەش، ئەم كارە رەنگە ببێتە هۆی سەرهەڵدانی شـك‌و گومـانیكی ناپێویسـت) بەسـەرنج دان بـەبێ ئاكـام مانەوەی هەولی دوو هەزار ساڵەی فەلسەفەی میتافیزیكی بۆ چارەسـەركردنی ئـەم (گومانـە ناپێویسـتە) ئاموژگارییەكـەی هوسیرل بەتەواوی بەجێیە! بروانە بۆ:

E.Husserl, Ideas, First Book: General Introduction to apure Phenomenology Martinus. Nijhoff publishers, London, 1982, p. 174.

٢٥-لەسـەردەمی ساد دا، واتـەنیوەی دووەمـی سـەردەمی هەژدەهەم، زانستی میكانیك‌و ئامرازو مەكینە میكانیكییەكان بەباشترین دەركەوتەی ئەقڵ‌و ئەقلخوازی دەژمێردرا؛ هەر بـەم بۆنەشـەوە، سـاد وەسـفیكی سەرانسـەر (میكـانیكی) لەجیهانیـەت‌و لـەزەت ئاراسـتە دەكـا. بـەلام، مەبەسـتی سەرەكییوی، لەبنـەرەتدا، وەسفی رەوتـی (ئـەقلانی) بوونـی هەلسـوكەوتی مرۆییـە كـە دواتـر لەسـەدەی بیسـتەمدا لەسەردەسـتی هەلسـوكەوتگەراكان بەشـێوەیەكی (زانسـتی) ئاراسـتەكرا. هـەروەها لـەخۆرا نییـە كـە دامەزرینـەری هەلسـوكەوتگەریتی، ف.ب. سـكینز، كیشـەی خـۆی، واتـە ئەوپـەری ئازادی‌و پلەوپایـەی، پیشـكەش كـردووە بەیـەكیك لەپالەوانەكانی بەرهەمەكانی ماركی دوساد، ژولیەت.

٢٦-مارتین هایدیگر، (پرسش از تکنولوژی)، فعلنامه ارغنون، شماره ١، بهار ١٣٧٣.

٢٧-بۆ روونکردنەوەی زۆرتر، بروانە بۆ: م.فرهاد پور، (نکاتی پیرامون زیباشناسی تئودرکردورنو، ماهنامە دوران، شمارە ١٣، تیرومرداد ١٣٧٥، ص ١٨.

28 Telpos, No.31, Spring 1977, p.120.

٢٩-ئەم لیدوانە دوای مەرگی ئادۆرنۆ لەبەرگی یەکەمی کۆی بەرهەمەکانی بەناونیشانی (کردەییەتی فەلسەفە) (بروانە بۆ پەراویزی پیشوو) چاپکرا. مارتین جەی بەمەبەستی ئاکادیمیك کردنی تەواوی تیۆری رەخنەگرانە هیندە بەپەلەیە کە تەنانەت یاساو ریساکانی کایەی لیکۆلینەوەی ئاکادیمیکیش رەچاو ناکات. جەی لەوەسفەکەی خۆیدا سەبارەت بەدابرانی قوتابخانەی فرانکفۆرت لەمارکسیزمو گۆرانکاریی فیکریی ئادۆرنۆ، هەر ئاماژە بۆ ئەم وتارە سەرەکییەی ئادۆرنۆ ناکاتو لەبری شوینیشدا تەنانەت میژووی چاپی وتارەکانو میژووی نووسینیان بەهەلە دەنووسیتەوە.

30-T.W.Adorno, Kierkegaard: Construction of the Aesthetic, p. 131.

٣١-بۆ کورتەیەك دەربارەی رەخنەکەی پۆل پیکوو نەبروانە بۆ:

Telpas, No. 32, summer 1977, pp.167-174.

32-T.W.Adorno, Negative Dialectics, R.K.P., London, 1973, p.183.

33-Ibid., pp. 177-80.
34-Ibid, p.190.

٣٥–ر.ك. بـه: والتربنيـامين، (ترهـايى در بـاب فلسـفه تاريخ)، ترجمه مراد فرهادپور در فعلنامه ارغنـون، شماره، ١١–١٢، پاييز دزسـتان ١٣٧٥، ص ٣١٧–٣٢٩.

٣٦–ئەم رستەیە لەپێش گوتارەکەی ماکس هۆرکهایمر بۆ ئەم کتێبە هەڵئاویردراوە:
Martin Jay, The Dialectical Imag ination, 1973. P.xII.


کتێبناسیی نووسەر

١–وەرگێرانەکان:

شجاعت بودن. پل تيلش. نشر علمى، چاپ اول ١٣٦٦، چاپ ادم ١٣٧٥.

حلقه انفقادس. ديويد هيوى. نشر روشنگران، ١٣٧١.

كتاب شاعران (تراكل، ريلكه وسلان). همراه با يوسـف ابازرى وضياء موحد.نهر روشنگران، ١٣٧٢.

بكت. آ. الوارز؟ طرح نو، ١٣٧٤.

پانن برگ: الهيات تاريخى. آلن گالووى. مؤسسـه فرهنگـى مراط ١٣٧٥.

الهيات فرهنگ. پل تيليش. همراه با فضل الله پـاكزاد. طرح نو، ١٣٧٦.

تجربه مدرنيته. مارشال برمن. طرح نو، چاپ اول ١٣٧٩ چاپ دوم ١٣٨٠.

فلسفه، معرفت وحقیقت. فریدریش نیچه. انتشارات هرمس، ۱۳۸۰.

۲–نووسینەکان:

سومین ترانهٔ رود (مجموعهٔ قصة). نهر روشنگران، ۱۳۷۱.

ادیان باستانی. تألیف واقتباس (همراه با یوسف ابازری). مؤسسهٔ تحقیقات فرهنگی، ۱۳۷۲.

عقل افرده (تأملاتی درباب تفکرمدرن). طرح نو، ۱۳۷۸.

۳–کتێبی داهاتوو:

ترجمهٔ دیالکتیك روشنگری اثر تئودورا آ دور نوو ماکس هورکهایمر، طرح نو.

مجموعهٔ مقالات، طرح نو.

مجموعهٔ سخنرانیها، انتشارات هرمسی.

٤–وتارەکان:

موراد فەرهادپور لەبەرئەوەی کە لەبواری وتارنووسین و وەرگێڕانی شیعرو وتاردا خاوەن ئەزموونێکی بەرفراوان و تاڕادەیەك کەم وێنەیە، هەر بۆیە لێرەدا تەنیا ناوی ئەو گۆڤارانە دەخەینە بەردەست کە وتار یان وتارەکانی ئەویان چاپ کردووە:

بیدار، دنیای نحن، دوران، راەنو، کارنامه، کیان، نگاه نو، نمایش

هەروەهاش سەرۆکی دەستەی نووسەرانی وەرزنامەی ارغنون–ە، کە بەیەکێك لەگۆڤارە بنەڕەتی و زانستییانەکانی

## فەرهەنگۆکی زاراوەکان

ئابووری: اقتصاد

ئابووریی: اقتصادی

ئاراستە: جهت

ئاراستەکردن: ادائه کردن

ئاسایی: عادی

ئاست: سطح

ئاسۆیی: افقی

ئاقار: حیطه

ئاکاری: ئەخلاقی

ئالۆز: پیچیره

ئامادەبوون: حضور

ئامراز: ابزار، وسیله، آلت

ئاوەز ئامرازی: عقل ابزاری

ئاوەلناو: صفت

ئوستوورە ناسی: اسطوره شناسی

ئوستوورە ناسانە: اسطوره شناستی، اسطوره شناسانه

ئەزموونخوازانە: تجربه گرایانه

ئەستوونی: عمودی

ئەقلانی: عەقلانی

ئەقلی خاوین: عقل پاك

ئەگەر: امكان

ئەمئەو: اینهمان

ئەمئەوەکی: اینهمانی

ئەندازە: هندسه

ئەندازیار: مهندس

ئەندام: عضو

ئەندامیتی: عضوین

ئەویدی، ئەویدیکە: دیگری

ئەویدیکەیی: دیگربودگی

ئەهوەنکردنەوە: آرامش بخشیدن

بابەت: موضوع،چیز، عین

بابەتیانە: عینی

بابەتیتی: عینیت

بابەتینیگەر: عینیت گرایی

بریاری: قراردادی

بگۆر: پویا، دینامیك

بنچینەیی: پایەاس، اساسی

بنەما: ساختار

بنەماخوازی: ساختارگراعی

بنەماخوازانە: ساختارگرایانە

بنەواشە: اصل

بنەرەتی: پایەاس، اساسی

بنیاتنان: بنیادنهادن

بوار: رشته

بوون: وجود، هستی

بووندار: موجود

بوونیانه: وجودی

بوونناسانه: هستی شناختی، هستی شناسانه

بوونەوەر: جاندار

بوونی رەها: وجود مطلق

بۆچوون: رەهیاخت، رویکرد

بەچشت بوون: شی شدگی

بەدیهاتن: آفرینش

بەرامبەر: مقابل

بەرامبەرێتی: تقابل

بەراورد: مقایسه

بەراوردکاری: تطبیق

بەراوردکارانە: تطبیقی

بەتاڵ: خالی

بەرایی: ابتدایی، نحستین

بەردەوامی: تداوم

بەرهەست: انضمامی

بەرهەمهێن: تولید، تولیدکردن

بەرهەم هێنانەوە: باز تولید، باز تولیدکردن

بەرهەم هێنەر: مولد

بەستێن: زمینه

بەڵگە: سند، دلیل

بەڵگاندن: استدلال

بەها سوننەتییەکان: ارزش های سنتی

بیچم گیری: شکل گیری

بیریار، بیرمەند: متفکر

بیریاری: تفکر

بێرێسا: بی قاعده

پاراستنی خود: صیانت نفس

پارچە فەلسەفییەکان: قطعات فلسفی

پاشەکشێ: عقب نشینی

پانتایی: عرصه

پاوانخوازانه، تمایت گرایانه، تمامیت خواهانه

پچڕان: گسست

پسپۆڕ: متخصص

پسپۆڕاز: تخصصي

پۆل: طبقة، کلاس

پۆلینکردن: طبقة بندس کردن

پۆلێنبەندیکردن: صورت بندس کردان

پێش مەرج: پیش شرط

پێش مێژوو: پێشتاریخ (مراحل یخستین)

پیشەی کولتوورسازی: صنعت فرهنگ

پێگە: مقام، جایگاه

پێوەندی: ارتباط

پەراوێزی: حاشیه ای

تاك: فرد

تاكايەتی: فرديت

تاكرەهەندی: تكساقی

تاكی، تاكەكەس: فردی

تايبەتمەنديی: ويزگی، خصوصيت

توانت: توانش

توخم: عنصر

توندوتيژی: خشونت

توێژينەوەی زانستی: پژوهش علمی

توێكارانە: تشريحی

توێكاری: تشريح

تەريك: منزوی

تەريكايەتيی: انزوا

تێگەيين: درك

تێگەيشتين: درك كردن، فهم كردن

تيۆر: نظرية

تيۆرزان: تيرۆدانەر: نظرية پرداز

جادوو: جادوو

جادوويی: جادوويی

جادووكار: جادووگر

جوانيناسی: زيبايی شناسی

جوانيناسانە: زيبايی شناختی، زيبايی شناسانە

جياواز: متمايز

جیاوازی: تمایز

چاخی بەرد: عصر حجر

چشت: شیء

چشتئاسا: شی دارە

چشتئاسایی: شی دارگی

چوارچێوە: چارجوب، نظام

چۆنایەتی: کیفیت

چەشن: نوع

چەشنی: نوعی

چەق مرکز

چەق سڕینەوە: مرکز زدایی

چەقێتی: مرکزیت

چەمك مفهوم

چەندایەتی:کمیت

چەندی: کمی

چیرۆکی پەریان: قصە پریان

چییەتی: ماهیت

حەشاردراو: پیمفان شدە، مخفی شدە

خاڵ: نکتە

خوازیار: خواهان

خواست: میل

خود: نفس، خود

خۆباوەڕی: خودباوری

خۆبەزلزانی: غرور

خەیاڵ: تخیل

خەیالکرد: تخیلی

خەیالئەنگیز: تخیل برانگیز

دابران: گست

دابەزاندن: فروکاستن

دابەزین: تقلیل یاختن

دابەشکاری: تقسیم

دامەزراوەی کۆمەڵایەتی: نهار فرهنگی

درۆیین: کاذب

دریژایی: درازا، طول

دژ:ضد، علیه

دژایەتی: ضدیت

دژواز: متناقض (ناسازە)

دژوازی:تناقض (ناسازگی)

دوانە: دوگانە

دۆخ: وضع، وضعیت

دۆران: باختن، باخت

دەربازبوون: خارج شدن، گزشتن

دەربر: بیانگر

دەربرین:بیان (کردن)

دەرکەوتن: اشکار شدن

دەرکەوتە: نمرد

دەروونشیکارانە: روانکارانە

دەروونشیکاری: روانکاوی

دەروونناسانە:روانشناختی، روانشنا سائە

دەروونناسی: روان شناسی

دەرەکی: خارجی، مبرونی

دەرهەست: انتزاعی

دەرهەستکاری: انتزاع

دەستکەوت: دستاورد

دەسەڵاتدار: مقدر

دەسەڵاتداریتی: اقتدار

دەنگ: آ را، صدا، دایە

دەنگدانەوە: انعکاس

دیاردە ناسانە: پریدارشنافتی، پریدار شناسی

دیالکتیك: دیالکتیك

راڤەکردن: تفسیرکردن

راڤەکار: مفسر

راگەیینەرە گشتییەکان: رسانەهای گروهی

رامیار: سیاستمدار

رامیاری: سیاست

رزگاری: رهایی

روالەت: هیئت، شکل، قالب

روانگەی بابەتیانە: دیدگاه علمی

رووبنەما: روساخت

رۆشنگەری: رۆشنگری

رەچەلەکناسانە: تبارشنافتی، بتارشناسانە

رەخنە: نقد، انتقاد

رەخنەکار: منقد

رەخنەگر: منتقد

رەخنەگرانە: انتقادی

رەگەز: نژاد

رەگەزپەرستی: نژاد پرستی

رەوت: روند

رەها: مطلق

رەهاگەری: مطلق گرایی

رەهەند: بعد

ریسا: قاعدە

ریسادار: قاعدەدار

ریسامەند: قاعدە مند

زاڵ: مسقط، غالب

زالیتی: تسلط

زانست: علم

زانستە سروشتییەکان: علوم طبیعی

زانستە ماتماتیکییەکان: علوم ریاضی

زانستە مرۆییەکان: علوم انسانی

زانستی، زانستیانە: علمی

زنجیرە قۆناخە کۆمەڵایەتییەکان: سلسلە مراتب

اجتماعی

زۆرینە: اکثریت

زۆرینەیی: کثرت

زەین: ذهن

زەینیەت: ذهنیت

ژێربنەما: زیرساخت

سەختەکاری: جمل

ساختەیی: جملی

سروشت: طبیعت، سرشت

سووژە: سوژە، سوبژە (شناسا)

سەرچاوە: منبع، مرجع

سەرچاوەیی: ارجاعی

سەرچەشن: کهن الگو

سەرچەشنی، سەرچەشنانە: کهن الگویی

سەردەمی دیرنە بەردی: دوره دیرینەسنگی

سەرکوتکردن: سرکوب کردن

سەرەتا: آغاز، منشأ

سەرەتایی: ابتدایی، مقواتی، نحستین

سەرەکی: اصلی

سەرکەشی: طنحیان

سەرکەش: طنحیان گر

سیحر: سحر

سیحراوی: سحرانگیز

شاراوەیی: ابهام

شارستانیتی: شارستانییەت: تمدن

شوناس: هویت

شیکاری: تحلیل

شیکارانە: تحلیلی

شیمانە: احتمال

شیوە: شیوە، شکل، صورت، طریق، شبه

غەریزە: غریزه

غەیببیژ: غیب گو

فالگر: فالگیر

فراوانی: کثرت

قووڵایی: عمق

قۆناخ:مرحله

قەیران: بحران

قەیراناوی: بحرانی

کاربرد: کاربرد

کارکرد: کارکرد

کاریگەریتی: تأثیر

کردە: کنشی

کردەوە: عمل

کردەوەیی: عملی

کردەیی: کشنشی

کردەییەت: فعلیت

کولتوور: فرهنگ

کۆڕ: جمع

کۆکردنەوە: جمع کردن

کۆیی: جمعی

کۆڵەکە: ستون، پایە

کۆمەڵ: اجتماع

کۆمەڵایەتی: اجتماعی

کۆمەڵگا: جامع

کەلوپەل: کالا

کەمینە: اقلیت

کەمینەیی: قلت

کیشە: کشمکش

گرنگایەتی: اهمیت

گشت: کل

گشتگیر: فراگیر

گشتی: کلی، عمومی

گشتیبیژ: کلیگو

گشتیتی: کلیت

گوتار: گفتمان، ضمن

گۆڕین: تمویغی (کردن)

گۆڕینەوە: مبادلە، تبادل (کردن)

گەڵاڵە: طرح

گەورە زنجیرەی بوون: زنجیر بزرگر هستی

گەورە گێرانەوە: کلان روایت، روایت بزرگ

گیانگەریتی: جان گرایی

گێرانەوە ناسانە: روایت شنافتی، روایت شناسانە

گێرانەوەیی: راوی

گێرەوە: روای

لاساییکردنەوە: تقلید (کردن)

لاساییکاری: تقلید، محاکات

لاساییکەرەوە: تقلیدگر.

لاساییکارانە، لاساییکەرەوەیی: تقلیدی

لاوەکی: فرعی

لۆژیکی شیوەیی: منطق صوری

لەخۆگر: دربرگیرندە، ماوی

لەخۆنامۆیی: از خود بیگانگی

مرۆڤ: شجر، انسان، آدم

مرۆڤانە: انسانی

مرۆڤایەتی: انسانیت

مرۆڤیەت: آدمیت

مرۆیی: شجری، انسانی

مسۆگەرکردن: تثبیت کردن

مەبەستمەند: هدخمند

مەبەستدار: هەفدار

مەتەڵ: معما، چیستان

مەتەلئاسا: معما دارە

مەتەلئاسایی: معما دارگی

مەجی: شرطي

نانەمئەو: نااینهمان

ناخ: بطن

ناسکار: شناسا

نامۆیی: میگانگی

ناوەرۆك: محتوی

ناوەکی: داخلی، درونی

ناوەکیکردنەوە: درونیکردن

نموونە: مثال، نمونه، الگو

نواندنەوە: بازنمایی

نواندنەوەیی: بازنمایانه

نووسین: نوشتن

نووسینە: نوشتار

نەگۆر: ایستا

واتا: معنی، مفهوم

واتە: یعنی

واقیع خوازانە: واقع گرایانه: ریالیستی

واقیع نوینی: واقع نمایی

وتە: گفته

وردبین: دقیق النظر

وزە بەرهەم هینەرەکان: نیروهای مولد

هاتوچۆ: حرکت

هاوساز: هماهنگ

هاوسان: مساوی، برابر

هاوسانی: مساوات، برابری

هاماو: کل

هزر: اندیشه

هۆ: علت، دلیل

هۆدار: علی

هۆداریتی: علیت

هۆکار: عامل

هۆشیارانه: خودآگا

هۆشیاری: خودآگاهی

هەتاهەتایی: جاودانه، ابدی

هەلرسکاو: منفعل

هەلگر: دربرگیرنده، حاوی

هەرمانی: جاودانگی

هەژینەر: تکان دهنده

هەوسارپچراو: افسارگیخته

هەلسوکەوتگەریتی: رفتارگرایی

هیز: قدرت

هیما: نماد

هیماخوازانه: نمادگرایانه

هیماخوازی: نمادگرایی

هیمایین: نمادین

یاسایی: قانونی